لێکۆڵینەوەی مێژوویی

## کەمینەکان و ڕۆڵیان لە ئاژاوەو

# کەوتنی دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا






کاروان ڕەشید محی الدین

# کەمینەکان و ڕۆڵیان لە ئاژاوەو کەوتنی دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا

کاروان ڕەشید محی الدین

چاپی یەکەم

٢٠١٤

ناوی کتێب: کەمینەکان و ڕۆڵیان لە ئاژاوەو کەوتنی دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا

نوسینی: کاروان ڕەشید محی الدین

بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی

تایپ: ڕیاز مەحمود کاکە

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠١٤

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی بێخود

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە (٢٢٠٤) ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە**

## پێشەکی

مێژووی ئیسلامیمان چەندین ڕووداوی دڵتەزین و ناخۆشی بەخۆیەوە دیوە کە لەلایەن ناحەزان و دژانی ئیسلامەوە نەخشەی بۆ کێشراوە، هەندێك لەو ڕووداوانە زیانی زۆر گەورەیان بە ئیسلام و بانگەوازەکەیی و موسڵمانان گەیاندووە، ئەوەتا قوڕەیش بڕیاری کوشتنی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەردەکات، ئەوە یاسرو سومەیەن بەدەستی ئەبو جەهلەکان شەهید دەبن، ئەوە جولەکەکانن لەژێرەوە دەبنە هاوپەیمانی قوڕەیش دژی یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری مەدینەدا.

ئەوەش هۆزە عەرەبەکانن لەژێر ناوی پەردەی بانگەوازدا بۆ هۆزو خێڵەکانیان دەیان سەحابەی قورئان خوێن و بانگخواز شەهید دەکەن، دڵی پێغەمبەرو ﷺ موسڵمانان پڕ لە ئێش و ژان دەکەن..

لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ئەوە خاچ پەرستانن بە شانازییەوە دەنوسن بۆ ئەوروپا کە هەتا سەر ئەژنۆی ئەسپەکانمان لە خوێنی موسڵماناندا سورە، لە دوای یەك سەدە وەك: دکتۆرعەبدوڵلا نەفیسی دەنوسێت: دەیان قەشەی

ئەوروپی ڕوویان کردە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی تەتەرەکان و ڕێگای ڕۆژهەلاتی ئیسلامیان پێ پیشاندان و ئەوانیش تەڕو وشکیان سوتاندو خەلیفەی موسڵمانان و دەیان سەرکردەی تریان بە وەحشیانەترین شێوە شەهید کردن.

ئیتر ئەوە مەپرسە گاورەکانی ڕۆژهەلاتی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلام لەبری سوپاسی خوای گەورەو موسڵمانان هاتن دەیان حیزبی عەلمانی و بێدینییان دروست کرد، ڕۆژێك بەناوی عەرەبایەتی و ڕۆژێك بەناوی سۆشیالیستی و ڕۆژێکی تریش بەناوی دیموکراتیەوە لەسەر سنگی جیهانی ئیسلامییان چاندن و بەربوونە گیانی موسڵمانان و دەیان و هەزاران کەسیان لێ شەهید کردن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا ڕۆژێك بێت و موسڵمانان بالآدەست بن و بیر لە تۆڵە سەندنەوە بکەنەوە، وەیان ڕێگاو ڕێبازێکی تر دەگرنە بەرو لە بری تۆڵە (فأنتم تلقاء) و لە بری دادگاکانی تەفتیشی خاچ پەرستان چەپکە گوڵی ئاشتی و پێکەوە ژیان پێشکەش بەکۆمەڵگا دەکەن.

ئێمەی موسڵمان پەروەردەی ئەو قوتابخانەیەین کە پێغەمبەر ﷺ مامۆستای بووە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لەدوای دە ساڵ لە ئاوارەیی و شەهیدکردنی دەیان هاوەڵی بەڕێزی بەدەستی قورەیشیەکان پێی فەرموون: بڕۆن و ئێوە ئازادن، ئەوەتا سەلاحەدینی باپیرمان هەمان کردار دووبارە دەکاتەوەو سەرکردەو دەیان سەربازی خاچ پەرستی بە دیلی دەکەونە ژێر

دەستی و، پاش چاودێری کردنیان و چارەسەر کردنی برینداره‌کانیان ئازادیان دەکات.

ئەم لێکۆڵینەوەی ژێر دەستی ئێوەی بەڕێزیش کە هەوڵ و ماندوو بوونی مامۆستای بەڕێز "کاروان رەشید"ە نمونەیەکی کەمی ئەو پیلانانەیە کە لەلایەن ناحەزانی ئیسلامەوە لەژێر دەست و بەجێ بەجێ کردنی ئەو کەمە ئاینیانە ئاڕاستەی جەستەی ئیسلامیمان کراوە، بەڵام ئێمەی موسڵمان تەنها وتەمان لەکاتی سەرکەوتندا بریتیە لە (انتم تلقاء) و ئەوەی لە فەرهەنگماندا هەیە ئەمەیەو، ئەوەی نیە گیانی تۆڵە سەندنەوەیە، بۆیە دەبێت ئەوانیش ڕێزی ئەم سۆز نواندنەی ئیسلام و موسڵمانان بگرن .

لەکۆتاییدا زۆر سوپاسی بەڕێزی دەکەم کە شەرەفی ئەوەی پێبەخشیم ئەم چەند وتەیە بنوسم، خوای گەورە تەمەنی درێژی پێ ببەخشێت و بیری ڕوناکتر بکات و زانیاری زیاتری پێ ببەخشێت بۆ خزمەت بەئیسلام و موسڵمانان .

لەگەڵ ڕێزدا

ناصح مجيد أحمد

## دەروازە

دەرکەوتنی کێشەی کەمینەکان، دەرئەنجامی ئەو شەپۆلە داگیرکاریانەیە کە وڵاتانی ئیسلامی لەسەر دەستی خاچ پەرەستان لە ماوەی ڕابردودا ڕووبەڕووی بونەوە، بێگومان بەرهەمی ئەم داگیرکاریانەش لاوازبوونی خیلافەت بوو، لێرەوە چەندین دەوڵەتی قەومی پاش سەربەخۆبونیان و جیابونەوەیان لە خیلافەت هاتنە ئاراوە.

سەرئەنجام ڕاستییە تاڵەکەمان بینی کە ڕمانی یەکجارەکی خیلافەتی ئیسلامی بوو، لێرە بەدوا ئیدی ئەو پەیوەندییە ئاینییە بەهێزە پسا کە لە ڕابردوودا هەموو موسڵمانانی بەیەکەوە گرێ دابو و، وەك یەك جەستە هەڵسوکەوتیان دەکرد، بەدڵنیاییەوە ئەگەر دەوڵەتێك لەسەر بنەمای ئیسلامی ڕاستەقینە بنیات نرابێت هیچ کات کێشەیەکی بەناوی کێشەی کەمینەکانەوە نابێت؟ چونکە ئیسلام لەسەر کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلامی فەرز دەکات لەگەڵ ئەهلی زیمەدا بەباشی هەڵسوکەوت بکەن.

ئەوە ئیمامی عومەرەو ڕۆژێکیان لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا بۆ ئاگاداربوون لەچۆنیەتی گوزەرانی خەڵکی مەدینە دەچێتە ناو بازاڕ، لەناکاو چاوی بە جولەکەیەك دەکەوێت کە خەریکی سواڵ کردنە؟! دیمەنەکە هێندە

کاریگەر دەبێت دەستبەجێ ئیمام عومەر دەهێنێتە گریان، گریانێکی زۆر بەکوڵ! ئیمامی عومەر ڕوویکردە جولەکەکەو فەرمووی: پاش ئەوەی وزەی گەنجیت و دەست ڕەنگینیت لەخزمەتی خەڵکی ئەم وولاتەو ئاوەدان کردنەوەیدا سەرف کرد، ئێستاش لەموحتاجیدا سواڵ دەکەیت؟! ئیدی دەستی جولەکەکە دەگرێت و لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتە ماڵەوەو خزمەتێکی باشی دەکات، دواتر خەزانەی بەیتولمال بانگ دەکات، داوای لێ دەکات موچەی بۆ ببڕێتەوە، موچەیەك بتوانێت ژیانی خۆیی و خانەوادەی دابین بکات، لەوێوە فەرمان بۆ هەموو ویلایەتەکانی وولاتی ئیسلام دەنێرێت و داوا دەکات پێویستە موچە بۆ هەموو جولەکەو مەسیحییە هەژارو بەساڵاچوەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی ببڕدرێتەوە، دەبێت پارەکە ئەوەندە بێت بەشی ژیانی خۆیان و خانەوادەیان بکات؟!

یەك لە پیاو چاکان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ڕۆژێك بەناو بازاڕدا تێپەڕبووم، لەناکاو چاوم بە پۆلیسێك کەوت پیاوێکی ئەهلی زیمەی بەگیرهێنابوو و دەیویست بەزۆر بەرەو شوێنێکی ببات و ئەمیش لەگەڵیدا نەدەچوو، منیش لێیان نزیك کەوتمەوەو لەو بارەوە پرسیارم لێکردو ئەویش گوتی: دەیەوێت بەزۆر بمبات بۆ ماڵی فلانە کەسی بەرپرس و بەبێ بەرامبەر کارم پێ بکەن و منیش نامەوێت بڕۆم لەگەڵیدا..منیش هەر ئەوەندە لەناو بازاڕ بەدەنگی بەرز گوتم: خەڵکینە فریاکەون ئەمە دەیەوێت زیمەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بشکێنێت و سوکایەتی بەم جولەکەیە

دەکات، دەستبەجێ خەڵکەکە پەلاماری پۆلیسەکەیانداو هەر ئەوەندەی پێ کرا بە شپرزەیی خۆی دەرباز بکات.

بەڵێ ئەمەیە هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە ئەهلی زیمە، بێگومان بەکارهێنانی وشەی (کەمینە)[1]، سوکایەتییەکی ئاشکرایە بە ئەهلی زیمە؟ چونکە لەئیسلامدا بەهیچ شێوەیەك کەم و زۆری و ڕەنگ و شێوە..پێوەر نین؟ بەڵکو پێوەر، ڕادەی لەخوا ترسانی مرۆڤەکانە، لەبەرئەوە بەوردبونەوەمان لە مێژووی ئیسلامی دەبینین، تا ئەو ساتەی خیلافەت بونی بەهێزی هەبوە لە هەموو ناوچەکاندا، بەجوانترین شێوە مافی ئەهل زیمە دابین کراوە؟ چونکە یەك لەو شتە نەفامیانەی ئیسلام لەناو گەلاندا هەڵی گرت شانازی کردنە بەزمان و هۆزو گەل و..هتد.

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ

---

[1] - لەجیاتی وشەی (کەمینە) حەز دەکەم وشەی (زیمە) بەکاربهێنم، بەلام گومانم وەهایە هەموو کەس لێی تێ نەگات؟چونکە لەئێستادا زیاتر ووشەی (کەمینە) بەکاردێت، بێ گومان ئەویش دەستی داگیرکەرانی ئوممەتی ئیسلامی لەپشتەوەیەو بەکارهێنانی ئەم وشەیان لەجیاتی وشەی (زیمە) کردووە بە ئەمری واقیع، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزە سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی و دارایی و ڕاگەیاندنەی کە دوژمنان بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان خستویانەتە گەڕ.

عَلِيمٌ خَبِيرٌ[٢].

هەروەك پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لـەم بـارەوە دەفـەرمووێت: ((یـا أیهـا الناس ألا ان ربکم واحد، وان أباکم واحد، ألا لا فضل لعربي على أعجمي، ولا لأعجمي على عربي، ولا الأحمر على الأسود، ولا أسـود علـى أحمـر الا بالتقوى، هل بلغت؟ قالوا بلغ رسول الله..))[٣].

ئەوە سەلمانی فارسیەو پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێت: سەلمان لـە ئال و بەیتی منە!.

بیلالی حەبەشیش گەورەترین پۆستی ئەو کاتەی ئیـسلامی وەرگـرت کـە بریتی بوو لە بانگدان، ئەوە تەقوا بوو وەهای کرد پێغەمبەری خۆشەویـست (ﷺ)، بیلال بۆ ئەو کارە پیرۆزە هەڵبژێرێت؟!.

جارێکیان بیلالی حەبەشی بە هەڵە پێ دەنێت بە جەبەلەی کوڕی ئەیهـەم دا کە لە تەنیشتی کەعبەدا دانیشتبوو، ناوبراو یەکێك بوو لە سەرۆك هۆزە بەناوبانگـەکانی قـوڕەیش و لـەو کاتـەدا موسـڵمان بـوو بـوو، جەبەلـە هەڵدەستێتەوەو زللەیەك دەدا لە بـیلال، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دادوەری کردن و فەرمووی: بیلال هەستەو زللەکەی لێ بدەرەوە؟!

جەبەلە بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) وت: من گـەورەی بـەنی ئەیهـەمم، چۆن ڕێگە دەدەی بەندە کڕداوێکـی وەك بـیلال زللەکـەم لێ بداتـەوە!؟ خـۆ

---

[٢]– الحجرات: ١٣

[٣]– أخرجه احمد، مسند الانصار: (٢٢٣٩١).

منیش هاوشێوەی ئەو موسڵمانم؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دادگەری ئیسلام وەهای داناوە زللەکەت لێ بداتەوە! بیلال زللەکەی لێدایەوە، جەبەلەی کوڕی ئەیهەمیش ڕاستەوخۆ مەجلیسەکەی بەجێ هێشت و لە ئاین هەڵگەڕایەوە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ئاهێکی هەڵنەکێشاو بڵێ بریا زللەکەت لێ نەدابایەتەوەو با ئەو سەرۆك هۆزەمان لەکیس نەچوبایە..؟!.

بێگومان ئامانج لە هاتنی ئیسلام لەگۆڕانی ئەم جیاوازیانەیەو بەهیچ شێوەیەك ئەم ئاینە ناچێتە ژێرباری بەرژەوەندی کەسێکی دیاری کراوەوە.

بە ئاوڕدانەوەمان لە مێژووی ئیسلامی، بۆمان دەردەکەوێت هیچ کات زۆرینەو کەمینە نەکراوە بە پێوەر، ئەوە ئەو دیموکراسیەتە درۆزنەی ڕۆژئاوایە بەیاسایەکی دەستکردی مرۆڤەکان، دیکتاتۆریەتی زۆرینەدەسەپێنێت و کەمینەکان دەکاتە ژێر دەستەو، بیانو دەداتە عەلمانیە داردەستەکانی خۆیان تا بکەونە وێزەی خەڵك و قەسابخانە بنێنەوە.

ئەوەش دادگەری پەیامەکەی پەروەردگارە سەلاحەدینێکی ئەیوبی کوردزوبان دەکاتە سەرۆکی دەوڵەتێکی ئیسلامی و پێشڕەوایەتی جەنگی دژە خاچ پەرەستان دەکات و لەقوڕیان دەنێت.

ئەوەش ئیمامی ئیبن تەیمیەو ئیبن خەلەکان و ئیبن سەلاحی شارەزووری و.. کە لە نەتەوە شیرین و ئیسلام دۆستەکەی کورد بون و هەمان کات دەستی بالآیان هەبوو لە بەئاگاهێنانەوەو ئاڕاستە کردنی ئومەتی

ئیسلامیدا.

ئەوەش تاریقی کوڕی زیادی ڕزگار کەری ئەندەلوسە، کە ناوبراو لە بەربەرەکان بوو.

ئەوە هەریەکە لە ئیمام ترمزی و نەسائی و ئەبوداودو..خۆ ئەمانە هیچیان عەرەب نەبوون، بەڵام لە زانستی فەرمودەناسیدا گەیشتنە لوتکە.

ئەمانەو هەزارەها نمونەی تری ناو ئەم ئیسلامە پیمان دەڵێن: لەم ئاینەدا کەمینەو زۆرینە نیە؟ تەنها پێوەر بۆ ڕێزی مرۆڤەکان ئاستی لە خواترسانیانە، تەنانەت ئیسلام ڕێگەی نەداوە بەشوێن کەوتوانی ئاینەکانی دانیشتووی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلامی بوترێت کەمینە؟

چونکە ئەوە جۆرێکە لە سوکایەتی کردن ، ئامانج لە هاتنی ئیسلام گەڕانەوەی ڕێزو شکۆیە بۆ مرۆڤەکان و، ئیسلام هیچ کات جیاوازی نەکردوە لەنێوان موسڵمانێك و بێ باوەڕێکدا؟ پەروەردگار لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە دەفەرموێت: ڕێزم لە هەموو مرۆڤەکان گرتووە بە جیاوازی بیرکردنەوەیانەوە.

بەردەوام ئیسلام ڕێزی لە شوێنکەوتوە ئاینیەکانی تری نیشتەجێی ناو دەوڵەتی ئیسلامی گرتوە، بەشێك لەو ڕێزگرتنەش بریتیە لە ناونانیان بە ئەهلی زیمە؟ چونکە وشەی کەمینە واتای پەراوێز خراو و بێ بایەخ دەگەیەنێت.

قسەکردن لە بارەی کێشەی کەمینەکانەوە مێژویەکی هێندە کۆن نیە،

بەڵکو بەکارهێنانی بۆ کەمتر لەدوو سەدە پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، ئیدی بە تێپەڕبوونی کات ووشەی (کەمینەکان) وەك دەستەواژەیەکی تایبەت بە ئەهلی زیمەی لیّ هات، هەروەك داهێنانی ئەم دەستەواژەیەو پەرەپێدانی و لکاندنی بە گەل و زمانە بچوکەکانی ناو جیهانی ئیسلامیەوە، لە سەرەتادا بەمەرامی دوژمنانی ئیسلام بووە، لەلایەك بۆ ئاژاوە نانەوە لەناو دەوڵەتی ئیسلامیداو، لەلاکەی ترەوە بۆ ڕێگە خۆش کردنی هاتنی خۆیان بۆ ناوەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بەناوی وەرگرتنەوەی مافی کەمینەکانەوە.

وە لەم سەردەمەی ئێستاشماندا دەوڵەتانی داگیرکەری وەك ئەمریکاو وولاّتانی ڕۆژئاوا، ئارەزوی ئەوە دەکەن دووبارە مافی کەمینەکان بکەن بە کارتی فشار لەسەر وولاّتانی ئیسلامی و بەبیانوی پارێزگاری کردن لە مافی کەمینەکان و بۆ دروستکردنی فشار لەسەر دەوڵەتە ئیسلامیەکان و سەپاندنی مەرجی خۆیان بەسەر ئەو ولاّتەی کە خۆیان مەبەستیانە، بەئامانجی دەست وەردان لە کاروباری ناوخۆیی و بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندییە بالاّکانی خۆیان.

کاروان ڕەشید محی الدین

شەوی ٢٠١٤/١/١١

## کەمینەکان لە کەلەپوری ئیسلامیدا

بەگەڕانەوەمان بۆ مێـژوو و فەرهـەنگی ئیـسلامی وشـەیەکمان بـەناوی "الأقلیات" دەست ناکەوێت، ئەمەش یەکێك بـوو لـەو گرفتانـەی لـەکاتی نوسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دوچاری هاتم، ئەمەش ناکاتە ئەوەی کە لـەناو دەوڵـەتی ئیـسلامیدا، شـوێن کـەوتوانی ئـاینی مەسـیحی و جولەکـەو.. نەژیاون، نەخێر بابەتەکە بەو شێوازە نیە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە جـۆری وشەکە شتێکی نوێیەو دوژمنان بۆ مەرامی تایبەتی خۆیـان ناوەکـەیان لـە ئەهلی زیمەوە کردوە بەکەمینەکان.

کەواتە ئەگەر بمانەوێت لە مێژووی ئیسلامیدا ئاگاداری بارودۆخ و ژیانی کەمینە ئاینییەکانی نـاو دەوڵەتـە ئیـسلامییەکان بـین، پێویـستە بـەناوی "ئەهلی زیمە، ئەهلی جزیە" وە، بەشوێن مێژوویاندا بگەڕێین؟

چونکە پێشتر ئاماژەیەکمان پێکرد، بەکارهێنانی ئەم وشەیە"الأقلیـات" دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داگیرکاری خاچ پەرەستان بۆ ولاّتانی ئیسلامی و، بەتایبەت لەپاش ڕمانی خیلافەتی عوسمانییەوە زۆر پەرەیان پێداوە؟

بەدڵنیاییەوە نـەبونی ئـەم وشـەیەش لـە فەرهـەنگی ئیـسلامیدا ئـەوە

ناگەیەنێت کە ئیسلام مافی ئەم کەمە ئاینیانەی دابین نەکردووە، وەك هەندێك بێ ئاگا دەڵێن..نا!! ڕاستەقینە بە پێچەوانەوەیە، بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی، موسڵمانان چۆن بۆ هەموو کێشەو بابەتێك سەرچاوەکەیان شەرعی خوای گەورە بووە، بەهەمان شێوەش بۆ هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ کەمینە ئاینیەکاندا، هەر سەرچاوەکەیان شەرعی خوای پەروەردگار بووە.

بەردەوام ئاینی ئیسلام داوای لە دەوڵەت و تاکی موسڵمانان کردووە بە باشترین شێواز لەگەڵ کەمینەکاندا هەڵسوکەوت بکەن، بەردەوام دەوڵەتە ئیسلامییەکان ڕەچاوی ئەوەیان کردووە بەباشی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کەمینە ئاینیەکاندا، جێبەجێ کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدابون ژیانێکی هێمنانە بۆ کەمینەکان دابین بکەن و هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە بووە کەمینەکان لە هێمنایەتیدا بژین.

بەگەڕانەوەمان بۆ مێژووی ئیسلامی بەئاشکرا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت ئەهلی زیمە ڕێزێکی زۆریان لێگیراوەو لەڕووی سودمەند بونیان لە دامەزراوەکانی دەوڵەت هاوشێوەی موسڵمانان مافی تەواویان هەبووەو، دەوڵەتی ئیسلامی ڕێگای نەداوە هیچ کەسێك سوکایەتی بەکەمینەکان بکات و لەو بارەوە موسڵمانی سەرپێچیکار بەتوندی لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە سزا دراوە؟ چونکە ئەهلی زیمە لە ئیسلام دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەنیانەو ئەو لەپەیمان و بەڵێنەکانیان

دەپرسێتەوە، وەك ئیبن عومەر دەفەرمووێت: كان آخر ما تكلم به النبى انـه قال: ((احفظوني فى ذمتى)).

هەروەك خوای گەورە ئاینی یەكتاپەرەستی و خوا بەیەكناسینی بۆ گرۆهی ئینس و جیننی ناردوەو، داوای لە مرۆڤەكان كردوە بە ئارەزووی خۆیان شوێنی ئەم ئاینە بكەون و، هیچ كات پەروەردگار ڕێگە نادات بەزۆر خەڵكی بهێنرێنە ناو ئاینی خواوە، وەك دەفەرمووێت: وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّـٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا [4].

لە ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلامدا بـەهیچ شـێوەیەك ڕێگـە نادرێـت بـە زۆر بێباوەڕێك ناچار بكرێت تا بێتە ناو ئاینی خواوە، كەواتە ئازادی لە ئـاین و ئاینداریدا ئەو مافە سەرەتاییەیە كە خوای گەورە بە مرۆڤەكانی بەخشیوە.

بەڵام بەداخەوە لەم سـەردەمی پێـشكەوتن وشارسـتانیەتەدا زلهێزەكـان بەناوی مافی مرۆڤ و پارێزگاری كردن لە مافی كەمینەكان دێنە ناو وڵاتانی ئیسلامییەوەو داگیریان دەكەن و سەربەستی و ئـازادی گـەلانی موسـڵمان

[4]– الكهف: ٢٩.

زەوت دەکەن و دوبارە بە ناوی پارێزگاری لە کەمینەکان لەڕێی داردەستەکانیانەوە لەوڵاتانی ئیسلامیدا دێنە ناو موسڵمانانەوەو، بەئازادی و بەناوی هاوکاری و کاری مرۆڤ دۆستی و...، بەئاشکرا پەیامی خاچ پەرەستان و بەگاورکردن لە قوتابخانەو شوێنە تایبەتی و گشتییەکاندا بەسەر ڕۆڵەی موسڵماناندا دابەش دەکەن، بەداخەوە زۆرجار موسڵمانی ساویلکە بەخۆشحاڵییەوە دیارییەکەیان لێ وەردەگرێت و لەوە بێ ئاگایە ئەوە بۆ هەڵگەڕاندنەوەی موسڵمانان و تێکدانی وڵات و کۆمەڵگاو خێزان و کلتورە ئیسلامیەکەمانە، خاچ پەرەستان بەم بیانوانەوە دێنە وڵاتی موسڵمانانەوەو بەمەبەستی هەڵگەڕاندنەوەی ڕۆڵەکانمان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، توندوتیژی و فەسادو بەدڕەوشتی لە وڵاتی موسڵماناندا پەرە پێ دەدەن.

## جۆرەکانی کەمینە

کاتێك خوای گەورە لەشاری مەککەدا پێغەمبەری خۆشەویستی (ﷺ) ناردو دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵکی بەرەو ئیسلام، دواتر بەتوندترین شێوە هاوبەش پەیداکەران بەرووی خۆیی و بانگەوازەکەیدا وەستانەوە، بەمەبەستی لەناوبردنی ئاینە نوێیەکەو شوێن کەوتوەکانی، بەناشیرین ترین شێوە کەوتنە ئازاردانی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵە بەرێزەکانی، بەڵام پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی ئارامگرییان هەڵبژارد تا ئەو کاتەی بەرەو مەدینە کۆچیان کرد.

ئەوەبوو پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و دەست پێ کردنی فتوحاتی ئیسلامی، ناوچەکانی ژێر دەستی موسڵمانان فراوان بونی زۆریان بەخۆیانەوە بینی، سوپای ئیسلامی ڕووی لەهەر وڵات و ناوچەیەك کردبێت، هیچ کات زۆری لە دانیشتوانەکەی نەکردوە تا بێنە ناو ئاینی خواوە؟

چونکە لە ئیسلامدا زۆرکردن لە ئـاین و ئایندارییـدا نیـە، وەك پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ﴾[°].

موسـڵمانان بـەردەوام بەپـشت بەسـتن بـە قورئـان و فـەرمودەو بەڵگـە شەرعیەکان، کاریان لەسەر موسڵمان بـوونی خـەڵکی کـردوەو هـیچ کـات ئیسلام زۆری بەکار نەهێناوە تەنانەت بۆ موسڵمان بونی تاکە کەسێکیش؟ هــەر لەبەرئەوەشــە بەدرێــژایی حــوکمی ئیــسلامی بێبــاوەڕان بــەردەوام لەچوارچێوەی دەوڵــەتی ئیــسلامیدا ژیانیــان بردوەتــە ســەر، بــەبێ ئــەوەی دوچاری هیچ ستەم لێکردنێك بن و هەمان کات ئازادی تەواویان هەبوە لــە چۆنیەتی ئەنجامدانی دروشمە ئاینیەکانی خۆیاندا.

بەکورتی بەپێی زاراوە شەرعیەکان کەمینەکان بەو کەسانە دەڵێن کە لــە "دار الاسلام" دا دەژین، مەبەست لە "دارالأسلام" بــەو ناوچــەیە دەوتــرێ لەژێر کۆنترۆڵی موســڵماناندایەو بــەپێی ئـاینی ئیـسلام حـوکمی دەکـەن و

[°]- البقرة: ٢٥٦.

تەنانەت ئەگەر موسڵمانان ژمارەیان زۆر کەمیش بێت.

هەرچی "دار الکفر" یشە بە پێچەوانەوە، بەو ناوچەیە دەوترێ کە لەلایەن دوژمنانی ئیسلام و بێ باوەڕانەوە دەبرێت بەڕێوەو حوکمی ئیسلامی تیادا جێبەجێ ناکرێت، ئەگەر ژمارەی موسڵمانانیش زۆرینەبن لەوەها حاڵەتێکدا، ناوچەکە هەر بە"دار الکفر" دادەنرێت.

بە کورتی: مەبەست لە کەمینەکان: بەو کۆمەڵە کەسانە دەوترێت کە لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدادەژین و خاوەن ئاینێکی جگە لە ئیسلامن لە ئاینی "جولەکە، مەسیحی..هتد" و هەمان کات هیچ تواناو دەستەلاتێکیان نیە لە چۆنیەتی ئاڕاستە کردنی دەوڵەتەکەدا، هەروەك کەمینەکان و ئەهلی زیمە لەڕووی جیاوازی ئاینەکانیانەوە دوو جۆرن، بەشێکیان خاوەنی ئاینی ئاسمانین و ئەوانی دیش خاوەنی ئاینی مرۆڤ کردو دەستکردن.

لە ئیسلامدا هەردوو جۆرەکە بەپێی ڕێنماییەکانی ئەهلی کیتاب مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، لەڕووی مۆڵەت پێدانیان بۆ مانەوەیان لەسنوری دەوڵەتی ئیسلامیدا، وە کەمینەکان لەڕووی کاتی مانەوەو

چۆنیەتی مانەوەیان لە چوارچێوەی دەوڵـەتی موسـڵمانانـدا دەکـرێن بـە دوو جۆری سەرەکییەوە:

یەکەم: ئەهلی (زیمـە) بـەو کەمینانـە دەوترێـت کـە بەشـێوەکی هـەتا هەتایی لەناو سنوری دەوڵەتی ئیسلامیدا نیشتەجێن.

ئەهلی زیمە: ئەو بێ باوەڕانە دەگرێتەوە کە حەز دەکـەن لـەژێر سـایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بژین بەڵام موسـڵمان بـوون ڕەت دەکەنـەوەو، ئـارەزوو دەکـەن کـە لـە (دارالاسـلام) دا ژیـان ببەنـە سـەرو داوا دەکـەن دەوڵـەتی ئیسلامی سەروماڵ و کەرامەتیان بپارێزێت، ئیدی چونیەکەو فەرق ناکـات، ئایا ئەو بێباوەڕانە هی ئەو وڵاتە بن کە لەلایەن ئیسلامەوە فەتح کرابێـت، یاخود لە وڵاتێکی تری بێ باوەڕانەوە هاتبن و حەز بە مانەوەی هەتا هەتایی بکەن لە چوارچێوەی دەوڵەتی (دار الأسلام) دا.

نابێت ئەوەلەیاد بکەین مانەوەی ئەم جۆرە کەسانە لە وڵاتی موسڵماناندا لەڕێی پەیماننامەیەکەوە دەبێت، کە لە نێوانی ئەوان و دەوڵەتی موسڵماناندا ئیمزا دەکرێت و تیایدا ئەرك و مافی هـەردوولا دیـاری دەکرێـت و لەسـەر هەردولاش پێویست دەکـرێ پـارێزەری بەنـدەکانی نـاو پەیماننامەکـە بـن،

بەمەش دەوترێت: پەیماننامەی ئەهلی زیمە، ئەگەر بیانەوێت ئەوا دەوڵەت دەتوانێت لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئاینی جولەکەو مەسیحیدا ئەم پەیماننامەیە ئیمزا بکات و سەبارەت بە هاوبەش پەیداکەران و بت پەرەستان و مەجوسەکان و..هتد، ڕاجیایی لەنێو زانایاندا هەیە، ئایا دەتوانرێت وەك ئەهلی زیمە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت، یاخود جگە لە موسڵمان بوون ڕێگەی تریان لەبەردەمدا نیە.

دووەم: ئەهلی (مستأمنون): بەو کەمینانە دەوترێت بەشێوەیەکی کاتی لە وڵاتی ئیسلامیدا نیشتەجێن، ئەو بێباوەڕانەش دەگرێتەوە کە لە وڵاتی بێباوەڕانەوەو بەمەبەستی ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی خۆیان بۆ ماوەیەکی کاتی ڕوو لە وڵاتی موسڵمانان دەکەن و هاوکات موسڵمان بوون ڕەت دەکەنەوە، نمونەی ئەوانەش وەك: شاندە حکومییەکان و بازرگانان و قوتابییان و..هتد.

بەڵام هەموو ئەو بێباوەڕانەی کە لە "دار الحرب" دا دەژین، ناچنە چوارچێوەی کەمینەکانەوە؟ چونکە لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا نیشتەجێ نین، وە ئەو بێباوەڕانەیشی کە لەو وڵاتانەدا دەژین و کە لەگەڵ موسڵماناندا لە هودنەدان، ئەمانیش بەهەمان شێوە ناچنە چوارچێوەی کەمینەکانەوە؟

چونکە ئەوانە لەولاَتێکدا دەژین کە بەشێك نیە لە (دار الأسلام). پێویستە ئاماژە بەوە بکەین هەڵگەڕاوەکان ناتوانرێت بخرێنە چوارچێوەی ئەهلی زیمەوە؟ چونکە کەسی هەڵگەڕاو لەدین دوو شتی لەبەردەمدایە: تۆبە کردن و پەشیمان بوونەوە یاخود کوشتن؟!

ئێستا بۆمان دەرکەوت بەکارهێنانی دەستەواژەی (الذمة ـ المستأمن) زۆرجوانترو گونجاوترە لە دەستەواژەی (الأقلیات)، چونکە بەکارهێنانی وشەکە خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لە سوکایەتی کردن بەو بێباوەڕانەی لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا نیشتەجێن، وە بەکارهێنانی ئەو وشەیە مانای جۆرێك لە ئاوارەیی و دوور لە کۆمەڵگایی ئەو کەسانەو بەسوك سەیرکردنیان دەگەیەنێت، ئەمە لە کاتێکدایە ئەو دەستەواژەیەی ئیسلام بۆ دانیشتوانی ناموسڵمانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی بەکاری دەهێنێت، ئاماژەیە بۆ گرنگی ئەم توێژەو بەهایەکی باڵایان پێ دەبەخشێت و، هەموان ئاڕاستە دەکات بەچاوی ڕێزەوە لێیان بڕوانین و بێوەفا نەبین بەرامبەریان و دەستپێشخەر نەبین بۆ پێشێل کردنی بەندەکانی پەیماننامەکە، بەشێك لە ئەهلی عیلمیش سەبارەت بە ئەهلی "زیمە" دەڵێن: زیمە، واتە: بردنە سەری پەیمان و بەڵێن و پێدانی ئارامی و دڵنیایی و ڕێزگرتن و گرێنتی دەستەبەرکردنی مافەکانی

دەگەیەنێت.

ئەهلی "المستأمن" بەو کەسە دەوترێت کە ئارامش و گرێنتی و دڵنیایی دەوڵەتی ئیسلامی دەدرێتێ، بەوەی لەماوەی دیاری کراوی مانەوەیدا هیچ جۆرە مەترسییەك بۆ سەر خۆیی و خانەوادەو ماڵ و سامان و ئاینی دروست نابێت تا ئەو ساتەی لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بێت، پاراستنی لە ئەستۆی دەوڵەتەکەیە.

## پەیماننامەی ئەهلی "زیمە"

پەیماننامەیەکە لەنێوان بێباوەڕانی ئەسڵی و دەوڵەتی ئیسلامیدا دەبەسترێت، لێرەدا مەبەست ئەو بێباوەڕانەیە کە ئیسلام ڕێگای نیشتەجێ بوونیان پێ دەدات لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیداو لەسەر هەردوولاش پێویستە پاپەندی بەندەکانی پەیماننامەکە بن.

لەو ئەرکانەی پەیماننامەکە دەیخاتە ئەستۆی زیمییەکە ئەوەیە پێویستە بڕێك پارە لەلایەن هەردوو لاوە ئەندازەکەی دیاری دەکرێت، بداتە دەوڵەتی ئیسلامی، ئەو بڕە پارەیەش بە "جزیە" ناو دەبرێت و ئاگاداری ئەوەش بین

"جزیە" بریتیە: لەو برە پارەیەی ساڵانە دەخرێتە سەر پیاوی عاقڵی ئازادی ئیشکەری دەوڵەمەندی بالغی غەیرە موسڵمان، کە لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژی و قبوڵی "هاوڵاتییەتی" کردووە لەو ولاتەداو، بەڵام ئیسلامی قبوڵ نەکردوە. مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمود لە تەفسیری ڕاماندا ئاماژە بە پێناسەی جزیە دەکات و دەفەرموویێت: جزیە: فەرمانێکی خواییەو لەبەر پاراستنی ئەمن و ئاسایشی نیشتیمان و پێشکەش کردنی پرۆژە خزمەتگوزاریەکان، لە پیاوانی بالغ و ئاقڵ و فامیدەو دەوڵەمەندەکان وەردەگیرێت، بەهەمان شێوەی موسڵمانان کە زەکات دەدەن، بەڵام جزیە لە پیاوانی نەخۆش و بەساڵاچو و هەژارو بێ ئیش و، ژن و منداڵ و کۆیلە و شێت وەرناگیرێت[٦].

پێویستە ئەهلی زیمە پابەندی خۆی دەربخات بە هەموو ئەو ئەحکامانەی لەلایەن ئیسلامەوە بەسەریدا جێ بەجێ دەکرێت، هەروەك دەبێت ئاماژە بەوە بدەین ئەحکامەکانی ئیسلام نابنە ڕێگر لەچوونیەتی ئەنجامدانی دروشمە ئاینییەکانی ئەو بێباوەڕانەو، چۆنیان بوێت ئازادن لە ئەنجامدانی پەرستشەکانیان لە ڕوانگەی ئاینی خۆیانەوەو، لەم بارەوە

---

٦- تەفسیری ڕامان.

دەوڵەتی ئیسلامی ئازادییەکی تەواویان بۆ دابین دەکات.

هەروەها لە بەرامبەر پێدانی ئەو پارەیەی پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، دەوڵەتی ئیسلامی پاراستن و پارێزگاری کردن لە سەروماڵ و کەرامەتی ئەهلی زیمە لە ئەستۆ دەگرێت و لە هەر جۆرە مەترسییەك ڕووبەڕوویان ببێتەوە، دەوڵەتی ئیسلامی بەرپرسەو لایەنی کەمتەرخەمی موسڵمانان لەهەر جۆرە ستەمێك کە لە ئەهلی زیمە بکرێت، هەڕەشەی زۆر توندی خواو پێغەمبەری (ﷺ) ڕووبەڕوو دەکرێتەوە، لە هەموو سەردەمەکاندا موسڵمانان گرنگییەکی زۆریان داوە بەپاراستنی ئەو پەیماننامانەی لەگەڵ ئەهلی زیمە گرێیانداوە، کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلامی بەردەوام لە وڵاتدا پێش فەراهەم کردنی ئاسایش بۆ موسڵمانان، لەخەمی ئەوەدا بوون ئاسایش و هێمنایەتی بۆ ئەهلی زیمە دابین بکەن؟ چونکە ئەوان بەخواستی خۆیان و لە ڕوانگەی بەخەم بونی ئیسلامەوە بۆیان، بڕیاری ئەوەیانداوە لەگەڵ موسڵماناندا ژیان ببەنە سەر، پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام هانی موسڵمانانی داوە بەباشترین شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەهلی زیمەدا بکەن، وەك وریایی دان بە موسڵمانان پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دەفەرموێت: ((من قتل نفسا معاهدا لم يرح رائحة الجنة، وان ريحها ليوجد من مسيرة اربعين عاما)).

واتە: هەرکەسێك یەك لە ئەهلی زیمە بکوژێت، بۆنی بەهەشت ناکـات، بێگومان بۆنی بەهەشت بە ئەندازەی چل ساڵ ڕێ دەکات.

ئەوە ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب تەنانەت لەسەرەمەرگیـشدا ئـەهلی زیمەی لەیاد نەکردو فـەرمووی: ئامۆژگـاری خەلیفـەی پـاش خـۆم دەکـەم لەگـەڵ ئـەهلی زیمـەدا بەباشـی هەڵـسوکەوت بکات،کـارە باشـەکانیان وەربگرێت و لەبەرامبەر خراپەکانیشیاندا لێبوردنی هەبێت، وە ئامۆژگـاری دەکەم بەوەی ئەهلی زیمە لەگەردنی خـواو پێغەمبـەری خـوادان (ﷺ)..، وەئەرکێکی ئەوتۆیان نەخرێتە سەر شان توانای ئەنجامدانیان نەبێت.

لەو ساتە زۆر دژوارەدا ئیمام عومەر یەك لە ئامۆژگارییە گرنگەکانی بـۆ خەلیفەی پاش خۆی، دڵفراوانی و نەرم و نیانی و چاوپۆشییەتی لـە هەڵـەی ئەهلی زیمەو داوای لێ دەکات وەفادار بێت بەو پەیمانەی کە لەنێوان ئەهلی زیمەو دەوڵەتی ئیسلامیدا ئیمزا کراوە.

## کەمینەکان و دەوڵەتی موسڵمانان

لەم دواییانەدا زۆر قسە دەکرا لە بارەی پەیوەندی موسڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیاندا هیچ جیاوازییەك ناکات ئەو پەیوەندییانە لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئاینە ئاسمانیەکان بێت، یان ئاینەکانی دی کە دەستکردی مرۆڤ، ئیدی لێرەوە چەندین دەستەواژە هاتنە ئاراوە لەوانەش: ئاشتی جیهانی، پێکەوە ژیانی ئاینەکان..هتد

بێگومان ئامانجی سەرەکی لە هێنانی ئەم بۆچونانە دروستکردنی گومان و دوو دڵییە لەناو موسڵماناندا سەبارەت بە بیروباوەڕی ئیسلامی.

یەکێکی تر لەو دەستەواژە نوێیانەی سەری هەڵدا(مصطلح الآخر)ە، مەبەستەکەشیان ئەو کەمینانەن کە لە وڵاتی ئیسلامیدا دەژین و دوژمنی سەرەکی ئیسلام و موسڵمانانن و هەمان کات لەناوجەرگەی کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا دەژین.

بەدرێژایی مێژوو ئەم کەمینە ئاینیانە بەسوود وەرگرتن لە چاوپۆشی و سنگ فراوانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئاستیاندا بەردەوام خەنجەری بێ وەفایی و غەدریان لە جەستەی دەوڵەت و ئوممەتی ئیسلامی داوە.

لێرەوە دەمانەوێ توێژینەوەیەك بکەین سەبارەت بە ڕۆڵ و کاریگەری کەمینە ئاینییەکان لە لاواز کردن و دواتر ڕووخاندنی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا.

بێگومان دژایەتی کردنی شەیتان و شوێنکەوتووانی بۆ ئەهلی ئیمان، دژایەتی و دوژمنایەتییەکی بەردەوامەو هەتا شوێنکەوتوانی هەردوولاش بوونیان هەبێت، ئەم دژایەتیەش درێژەی دەبێت، ڕوون و ئاشکرایەو سەرئەنجامیش سەرکەوتن بۆ ئەهلی ئیمانەو ڕۆژێك دێت پەروەردگار زەوییەکەی لە ئەهلی شەیتان پاك دەکاتەوەو دەیسپێرێتەوە بە بەندە دڵسۆزو باوەڕدارەکانی، ئەو ڕۆژە گەلێ نزیکە کە پەروەردگار سەرزەوی لە پۆخڵەواتی شەیتان و شوێنکەوتوانی خاوێن دەکاتەوە.

وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا کێبەرکێی نێوان بەرەی ڕەحمان و بەرەی شەیتان بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی دوایی، بێگومان ئەهلی ئیمان شوێنکەوتوانێکی هەن بانگەشە بۆ یەکتاپەرستی و ڕەوشتی جوان دەکەن و ئەرکی سەرەکی ئەم بەرەیە هەوڵدانە بۆ دروست کردنی کۆمەڵگایەك بەو شێوەیەی خوا داوای دەکات، هەروەك ئەرکی سەرەکی شەیتان و شوێنکەوتوانیشی، هاویەش پەیدا کردنە بۆ خواو نانەوەی فەسادو خراپەکارییە لەسەر زەوییدا.

گومان لەوەدا نیە ئیمان مرۆڤەکان دەخاتە سەر شاڕێگەی ژیانی نەبڕاوەو هەمیشەیی و بەرەو بەهەشت بەڕێیان دەکات، بە پێچەوانەوە شەیتان

مرۆڤەکان بەرەو لەناوچوون و دۆزەخ ڕاپێچ دەکات، ئەهلی ئیمان ئـەوە فێـر شوێنکەوتوانی دەکات و تێیان دەگەیەنێت ئێمەی مـرۆڤ نابێـت یاسـاکانی مرۆڤ بوون پێشێل بکەین، شەیتانیش مرۆڤەکان لە مرۆڤایەتی دادەبەزێنێت بۆ سەر ئاستی ئاژەڵ. .لێرەوە پێویـستە بگەینـە ئـەو بـاوەڕەی خۆمـان بـۆ یەکێك لەم دوو ڕێگایە سـاغ بکەینـەوە، یـان بەهەشـت هەڵبـژێرین؟! یـان دۆزەخ؟! یان بەندەی ڕەحمان بین یاخود بەندەی شەیتان بـین: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ ﴾[٧].

بەڵێ کێبەرکێی نێوان ئەم دوو هێزە بەردەوامەو کۆتاییەکەشی سەرکەوتنی ئەهلی ئیمانە، وەك قورئان دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ  ﴾[٨].

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین دژایـەتی شـەیتان و شـوێنکەوتوانی بـۆ ئەهلی ئیمان بەپێی کات و سەردەم و هـەروەها بـەپێی جـۆری ئامڕازەکـان گۆڕانکاری بەسـەردا دێـت، لەگـەڵ پێـشکەوتنی زانـست و تەکنـەلۆژیادا، شێوازی دژایەتی کردنـی ئـەهلی ئیمـان پێـشکەوتو بـوەو گۆڕانکـاری لـە

---

[٧]– الاحزاب: ٤.

[٨]– الانبياء: ١٠٥.

ئامرازەکانی دژایەتی کردنی موسلماناندا کراوە.

لەبەرئەوە بەپێی قۆناغ و سەردەمەکەش لەسەر ئەهلی ئیمان پێویستە لە ئامرازی بەرەنگاربوونەوەی ئەهلی شەیتاندا، داهێنان و گۆڕانکاری بکەن، تا بتوانن لەبەرانبەر شەیتان و شوێنکەوتوانیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن، هەموو سەردەمێك مرۆڤ بۆ بەرگری لە خۆکردن پەنای بردوەتە بەر چەك و ئەسڵەحە، وەك دەزانین چەکی سەردەمی کۆن شمشێرو شیرو مەنجەنیق بووە، بەڵام ئێستا جیهان پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینیوەو چەکی بەرگری خۆی لە فرۆکەی جەنگی و موشەك و ئەتۆم و لێزەرو...هتد دەبینێتەوە.

لە ڕابردوودا موسڵمانان لە غەزاکاندا پاش پشتیوانی خوای گەورە ئەگەر لە جەنگێکدا دووچاری لاوازی هاتبن بە بەکارهێنانی فیڵی کاتی شەڕ توانیویانە جەنگەکە لە بەرژەوەندی خۆیان کۆتایی پێ بهێنن، بەڵام لەم سەردەمەدا دەبینین دوژمنانی ئیسلام شێوازی جەنگ کردنیان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازەو، هەموو نەخشەیەکی دۆزەخی بەکاردەهێنن بۆ لاوازکردن و لەناوبردنی ئوممەتی ئیسلامی.

لە ئەمڕۆماندا یەکێك لە چەکە گەورەکانی دوژمنان بۆ لاواز کردن و خستنی وڵاتانی ئیسلامی ئابڵوقەی ئابوورییە، بەبێ هیچ جۆرە زیانێکی گیانی زۆرترین سوود لەم شێوازی دژایەتییە وەرگیراوە لە دژی ئوممەتی ئیسلامی لەلایەن دوژمنانەوە؟

چونکە بەهۆی سەپاندنی ئابڵوقەی ئابورییەوە دەتوانن مەرج بەسەر ئەو

ولاتەدا بسەپێنن خۆیان مەبەستیانە، بەبێ ئەوەی دلۆپێك خوێن برێژێن دەست دەخەنە گەروی موسڵمانان، بێگومان ئەو ئابلۆقە ئابوورییەی لە سالانی نەوەدەکاندا ڕووبەڕووی خەڵکی کوردستان و عێراق بویەوە، نمونەیەکی تا ڕادەیەك نزیکی ولاتی خۆمانە، سەدام بەرپرسی جەنگ و کارەساتەکان بوو، بەلام ئەوان ئابلۆقەی ئابوورییان ڕووبەڕووی گەل کردەوە.

یەکێکی تر لەو چەکە ترسناکە نوێیانەی لەلایەن دوژمنانەوە لە دژی گەل و گۆمەڵگا ئیسلامییەکان بەکاردەهێنرێت چەکێکە بەناوی "چەوساندنەوە یان کپ کردنی ئازادییە ئاینیەکان".

هەروەك دەبینین لە ڕابردودا ئەم چەکە لە دژی هەریەکە لە سعودیەو میسر بەکار هات، لەم جەنگەدا میسر تا ڕادەیەك لەسعودیە زیاتر بەرگری کرد، بەلام دواترو لە ژێر فشاری ئەمریکادا میسر بەناچاری خۆی دا بەدەستەوە، سەرئەنجام چەندین بڕیاری ناڕەوای بەسەردا سەپێنرا، وەك هەڵوەشاندنەوەی هێڵی "هەمایون" و دامەزراندنی چەند قیبتییەك لە وەزارەتە گرنگەکانی میسردا، بە نموونەش وەزارەتی دارایی سپێردرا بە یوسف غالی.

پاشان قۆناغی ملکەچ کردنی میسر پێی نایە قۆناغێکی نوێوەو خۆی لە دیاری کردنی ڕۆژی جەژنی قیبتییەکاندا دەبینییەوەو "٧" ی یەنایەر بەشێوەیەکی ڕەسمی کرایە جەژنی قیبتیەکانی میسر لە سەرانسەری ولاتدا، هەروەك هەوڵ و کۆششی قیبتییەکان بەردەوام بوو بەئاراستەی زیاتر ملکەچ

کردنی حکومەتی میسر لەبەردەم داواکاریەکانیاندا، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی قیبتیەکان داوا بکەن زمانی قیبتی بە وێنەی زمانی عەرەبی بکرێتە زمانی فەرمی وڵات، موسڵمانان لە ئەنجامی نەشارەزاییان بەرامبەر بە ئاین و مێژووەکەیان، ئەو نموونانە دەهێننەوە کە گومان و تۆمەتیان لەسەرەو پەرەشی پێ دەدەن، بەمەش دەکەونە ململانێیەکی توندەوە بەناوی بەرگری کردن لە ئیسلام کۆنگرە دەبەسترێت بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام دژی ئەو هێرشانەی دوژمنان دەیکەنە سەری.

زانایان ئەو جۆرە هێرشانە بەرپەرچ دەدەنەوە بەو شێوەیەی ئێمە هەڵەکارو تاوانبارین! دواجار هەڵوێستێکی سادە دەنوێنن و سەرئەنجام دەکەونە تەئویل کردن و ڕاستییەکانی ئیسلام دەشێوێنن بەشێوەیەك هەستی پێ ناکەین.

ئەمەش پێشتر باسمان کرد لەو کاتەی ئینگلیز میسری داگیرکرد، بەناوی پارێزگاری کردن لە قیبتیەکان و لەو پێناوەدا پڕوپاگەندەیان بڵاوکردەوە، بەهەمان شێوە زانایانی ئوممەتی ئیسلامی و ڕیش سپییەکان خۆیان لەو بەرگری کردنە دوورخستەوە، خۆزگە وەها نەبووایە.!! کاتێك شێخی ئەزهەر نامەیەکی پێشکەشی کۆنگرەی ئایینە جیهانییەکان کردو تیایدا هاتووە:

"ئیسلام لە دڵی موسڵماناندا ڕەگی بوغزو حقدی ئاینی هەڵکێشاوە لەبەرانبەر شوێنکەوتوانی ئایینە ئاسمانییەکانی تر، وە بڕیاری بوونی زەمالەیەکی جیهانی داوە لەنێوان تاکەکانی مرۆڤدا لەڕووی جۆرەوە، هیچ

ڕێگرییەك نیە بۆ پێکەوە ژیانی ئایینەکان شان بەشانی یەکتر". بێگومان دەکرێت بیرو باوەڕی موسڵمانان ڕووبەڕووی هێرش و دوو دڵی و گومان ببێتەوە.

نامانەوێت درێژە بە باسەکە بدەین بەڵکو تەنها بە ڕستەیەك پیلان و نەخشەی دوژمنان لە دژی ئیسلام و موسڵمانان دەخەینە ڕوو، بەردەوام ئەهلی ئیمان بەوە تاوانبار دەکەن گوایە ئێمە چەوسێنەرەوەی کەمینەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامین.

بەڕای ئەوانیش ئەم هەڵسوکەوتە خراپەی موسڵمانان بەرامبەر کەمینەکان لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە موسڵمانان لە ڕوانگەی بیروباوەڕی (العقیدة الولاء والبراء) ەوە، هەڵسوکەوت لەگەڵ کەمینەکان دەکەن، بەلام لێرەدا پرسیارێك دەوروژێنرێت، کە لەسەر موسڵمانانە وەلامی بدەنەوە؟ چونکە دوژمنەکانمان هیچ گرنگی بەوە نادەن و هاوکارمان نابن، هەرچەندە زۆرترین بەڵگەش لەو ڕوانگەیەوە کۆبکەنەوە بێ سودەو ئەوان هیچ دان بە ڕاستیەکاندا نانێن و خۆیان بێ ئاگا دەکەن و سەنگەری دژایەتی کردنی موسڵمانان چۆڵ ناکەن.

پرسیارەکەش ئەوەیە: هەڵوێستی کەمینەکان چییە سەبارەت بەو دەوڵەتە موسڵمانەی ئەوان لە سێبەریدا بەبێ ترس دەژین؟ ئایا بواری پێکەوە ژیانی ئەو کەمینانە کامەیە، لەگەڵ مانای هاولاتی بوونی تەواو..؟

ئایا ئەو کەمینانە مافیان هەیە لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا بژین، ئەی

کار دەکەن بۆ بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتەی کە لەژێر سایەیدا بەخۆشی ژیان دەگوزەرێنن..؟ یان ئەوانە تاپوری پێنجەمن و لەدژی ئەو دەوڵەتە موسڵمانەی پارێزگاری لێ دەکردن و بە هێمنی ژیانیان لەژێر سێبەریدا دەگوزەراند.

ئەوان داوامان لێ دەکەن خۆشمان بوێن و وامان لێ بکەن وەك موسڵمانان لە دڵماندا بن پێش ئەوەی لە جەستەماندا بوونیان هەبێت، ئایا ئەوان بۆچی پرسیار لە هەڵوێستی خۆیان ناکەن سەبارەت بە موسڵمانان.؟ ئایا بە کتێبە مێژووییەکاندا گەڕاون سەبارەت بە کردەوەی کەمینەکان لەگەڵ موسڵماناندا؟ ئایا لە ڕووداوەکاندا هەڵوێستیان چۆن بووە بەرامبەر موسڵمانان لە کاتێکدا ئەوان کەمینە بوون و لە کۆمەڵگایەکی غەیری کۆمەڵگای موسڵماناندا بوون؟ وە چۆن هەڵس و کەوت و ڕەفتاریان لەگەڵ زۆرینەدا کردووە؟

لێرەوە دەچینە ناو ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامییەوە، بۆ زانینی ئەندازەی ئەو تاوانانەی کەمینەکان ئەنجامیان داوە لە دژی ئەو کۆمەڵگاو ولاتەی تیایدا ژیاون، لێرەوە کەمێك ئاشناتان دەکەین سەبارەت بە ڕۆڵی ترسناکی کەمینەکان لە ڕوخاندنی زۆرێك لە دەوڵەت و میرنشینە ئیسلامییەکان بەدرێژایی مێژوو.

## جولەکەکان و هەوڵە بەردەوامە شکست خواردووەکانیان، لە بۆ ڕووخاندنی یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی

کاتێك باسی ڕۆڵی کەمینەکان و کاریگەرییان دەکەین لە ڕوخاندنی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا، ناکرێت باسی ڕۆڵی ئەمان نەکەین لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکەم دەوڵەتی ئیسلامیداو بەرنامە نهێنی و ئاشکراکانیان لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا بۆ ڕوخاندنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی تازە لەدایك بوو بوو.

ئەمە لەکاتێکدایە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ گەیشتنی بە شاری مەدینەو دروستکردنی دەوڵەتەکەدا دەستی هاوکاری و ئاسایش و وەفای بۆ ئەم کەمینە جولەکانە درێژ کردو بۆ ئەو مەبەستەش پەیماننامە لەنێوانیاندا مۆر کرا، بەلاّم ئەوان دەستبەجێ لە ژێرەوە دەستیان لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا تێکەڵ کرد.

پاش ئەوەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەلاّن لەژێر گوشارو هەڕەشەو ئازارو ئەشکەنجەی بێباوەڕانی مەککەدا، ئەو شارەیان بەجێ هێشت و بەرەو مەدینە کۆچیان کرد، ئیدی هەر لەسەرەتاوە خۆشەویست (ﷺ)دەستیکرد بەئامادەکارییەکانی بۆ دروست کردنی یەکەمین دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامی، بۆ ئەو مەبەستە هەستا بەدروست کردنی مزگەوتی مەدینەو، کۆمەڵگای شاری مەدینەش چوار توێژی سەرەکی تیادا دەژیان.

پێویستییەکی ئەو سەردەمەش بوو بۆ موسڵمانان بەرنامە ڕێژییەك و یاسایەك بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنی ئەم چوار توێژە لەگەڵ یەکتریدا دابڕێژرێت، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) هەستا بەدانانی یەکەمین دەستوری مەدەنی بەئاراستەی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنی ئەم چوار پێکهاتەیە لەگەڵ یەکتریداو دیاری کردنی ماف و ئەرکی هەریەکە لەم چوار توێژە گرنگەی مەدینە.

بێگومان یەکەمین دەستوری مەدەنی کە لە مێژوودا دانرابێت بۆ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وولآت، دەستوری مەدینە بوو؟ ئەمەش پێشکەوتوویی ئەم ئاینەمان بۆ دەردەخات کە لە تاریکترین سەدەکانی ژیانداو لەو سەردەمانەی خەڵکی خەریکی داروبەرد پەرستن بوون، پەروەردگار ئەم ئاینەی بەدیاری بۆ خەڵکی سەر زەوی نارد، هەتا مرۆڤەکان لە کۆیلایەتی ڕزگار بکات و بەرەو پەرستنی خوای گەورە ئاراستەیان بکات.

دانانی دەستوری مەدینە گەورەترین وەڵامە بۆ هەموو تاغوتان و مڵهوڕان و پێیان دەڵێت: نابێت چیدیکە یاساکانی جەنگەڵستان و دارستان ببێتە داڕێژەری ژیانی کۆمەڵگا.

دەستوری مەدینە یەکەمین دەستور بوو لە ڕێی یاسا ئاسمانیەکانەوە سەرلەنوێ ژیان و ژیاری مرۆڤەکانی سەر زەوی داڕشتەوەو عەدالەتی خوایی چەسپاندو دوبارە مافی بۆ خاوەن ماف گەڕاندەوە.

**بەکورتی دانیشتوانی شاری مەدینە پێك هاتبوون لە:**

**یەکەم: کۆچ کەرەکان**

بەو باوەڕدارانە دەوترا کە لەپێناوی پاراستنی بیروباوەڕەکەیان، ماڵ و سەروەت و سامانیان بەجێ هێشت و لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کۆچیان کرد بۆ مەدینەو...

**دووەم: پشتیوانەکان**

بەموسڵمانانی ناو شاری مەدینەو هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج دەوترێت: پشتیوانەکان، ئەمان بوون لە پەیمانی یەکەم و دووەمی عەقەبەدا هاتن بەدەم بانگەوازی خواییەوەو بوونە پشتیوانی پێغەمبەرو (ﷺ) موسڵمانان و ئاینی ئیسلام و پەیمانیاندا بەوەی ئەمان ئامادەن لە شارەکەیاندا پێشوازی لە موسڵمانانی شاری مەککە بکەن و لە هەمان کاتدا دەبنە پارێزەریان لە دەست هەر جۆرە هێرشێکی چاوەڕوان کراوی بێ باوەڕانی مەککەو..

**سێ یەم: دووڕووەکان**

بەو دانیشتوانانەی مەدینە دەوترێت کە موسڵمان نەبوون و ئامادە نەبوون بێنە ناو ئاینی خواوەو حەزیان بەهاتنی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو لە

بۆ مەدینەو بەلاٚم لەترس و ناچاریدا بە زاریان دەیانگوت ئێمەش موسڵمانین و بەشداری زۆربەی دروشمەکانی ئیسلامیان دەکردو، لە ژێریشەوە خەریکی دەست تێکەڵکردن بوون لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامداو ڕقیان لەخواو پێغەمبەرو (ﷺ) موسڵمانان دەبویەوەو..

**چوارەم: جولەکەکان**

خراپترین و دەرون نەخۆشترین گەلن لە مێژوودا، ڕەگەزی جولەکەکان دەگەڕێتەوە بۆسەر بەنی ئیسڕائیل، جولەکە هەر لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە بە دڵ پیسی و ئاژاوەو ڕق و کین دەناسرانەوە، جوەکان لە مێژوودا بە کردەوە پیس و چەپەڵەکانیاندا دەناسرێنەوە، ئەمە جگە لەوەی زۆرێك لە پێغەمبەران بەدەستی ئەم گەلە چەپەڵە شەهید کراون، بۆ نموونە:

* ڕەگەزی جولەکە دەگەڕێنەوە بۆ سەر بەنی ئیسڕائیل و بریتین لە یوسف و یانزە براکەی، دواتر کەوتنە پیلان گێڕان بۆ شەهید کردنی پێغەمبەر یوسف و ..کاتێکیش لە دەستیان ڕزگاری بوو و پاش ئەوەی لە ولاٚتی میسر دەسەلاٚتی گرتە دەست و براکانی هێنایە لای خۆیی و دەستیاندایە کارو کاسپی و دواتر بوونە بەندەی دینارو زێڕو زیو، پاشان لەلای خەڵکی میسر خۆیان ڕیسواو سوك کردو سەرئەنجام بوونە ژێر چەپۆك و ئازارو سزایان چەشت.

* لەسەردەمی پێغەمبەر موسادا خوای گەورە دەرووی ڕزگاربونی لێ

کردنەوەو بە لەتبونی دەریاکەو پەڕینەوەیان لە دەستی فیرعەون و سوپاکەی ڕزگاری کردن و بە بەرچاوی خۆشیانەوە، فیرعەون لەناو ئاوی نیلدا خنکا، پاش بەرێکەوتنیان لە بیابانی سیناوە بەرەو فەلەستین کەوتنە پرتەو بۆڵەو دەیانگوت: بریا هەر لە میسردا بووینایە بەسنەبوو بەردەوام لە پاڵ مەنجەڵی گۆشتدا لێی ڕاکشابوین و...، ئەمە بەشێکی زۆر کەمە لە هەڵوێستی جولەکە.

پاش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) برایەتی لەنێوان کۆچەرو پشتیواناندا بەست، هاوکات بەرامبەر جولەکانی مەدینە کارێکی یەکجار مەزنی ئەنجامدا، بریتی بوو لە ڕێز لێگرتنیان و دۆستایەتی و پەیمان لەگەڵ بەستنیان، بۆ ئەوەی بە هەموانەوە ژیانێکی نوێ لە مەدینەدا بەسەر ببەن و پارێزەری شارەکەش بن لە هەر دەست درێژییەکی دەرەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) بەلایەوە گرنگ بوو لەگەڵ ناموسڵمانەکانیشدا پەیمان و ڕێکەوتنی هەبێت و مەبەستی بوو بە هەموو لایەکەوەو بەجیاوازی ئاین و بیرکردنەوەوە بەئاشتی لە مەدینەدا بژین و، لە حاڵەتی ڕووبەڕوبونەوەی دەستدرێژییە دەرەکیەکاندا هەموان بەیەکەوە بەرگری لە شارەکەیان بکەن.

نزیکترینی ئەو ناموسڵمانانەی دراوسێی مەدینە بوون بریتی بوون لە جولەکە، ئەمانە لە دڵەوە زۆر ڕقیان لە موسڵمانان دەبویەوە، بەلاَم بەشێوەی کرداری تائێستا شتێکی ئەوتۆیان لە دژی موسڵمانان ئەنجام نەداوە شیاوی باس کردن بێت، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی

نیەت پاکی و دەستی ئاشتی خوازی موسڵمانانیان نیشان بدات بەئومێدی ئەوەی دەست لە کارە خراپەکانی مێژووی ڕابردویان هەڵبگرن، ئەوەبوو پەیماننامەیەکی لەگەڵ مۆرکردن لە پەیماننامەکەدا هەموو جۆرە ئازادییەك بۆ جولەکەکان فەراهەم کرابوو.

بەکورتی لێرەدا ئاماژە بەهەندێك لەوبەندانەی پەیماننامەکە دەدەین کە تایبەتن بەجولەکەکانەوە، وەك:

١- جولەکەکانی (بني عوف) ئوممەتێکن لەگەڵ ئیمانداراندا، جولەکە ئاینی خۆیان هەیەو موسڵمانانیش ئاینی خۆیان هەیە، غەیری هۆزی (بني عوف) یش هەمان ماف و ئازادییان هەیە.

٢- هەموان پشتگیری یەکن دژ بە هەرکەسێك بیەوێت دژایەتی پەیماننامەیە بکات.

٣- جولەکە خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانەو موسڵمانانیش خەرجییان لەسەر خۆیانە.

٤- جولەکەو موسڵمانەکان دەتوانن لەنێو خۆیاندا ئامۆژگاری و کاری چاکە پەرە پێ بدەن، بێ ئەنجامدانی هیچ جۆرە خراپەیەك.

٥- هەموو کەسێکی ستەم لێکراو پشتیوانی لێ دەکرێت.

٦- جولەکە لەگەڵ موسڵماناندا یەکدەنگ دەبن، چەندە جەنگیان لەگەڵدا بکرێت.

٧- هەرکەسێك سەر بە ئێمە بێت لە جولەکە، ئەوا بەهەموو شێوەیەك

پشتیوانی دەکەین، ستەمیان لێ ناکرێت و کەسیش گەلەکۆمەیان لە دژ ناکات.

٨- هەرچی ڕوویدات لەنێو مۆرکەرانی ئەم پەیماننامەیەدا لە شەڕو دەمەقاڵێ، ئەوا کێشەکەیان ڕووبەڕووی پەیامی خوای گەورە دەکرێتەوە.

٩- زەوی ناوشاری مەدینە حەرامە، لە پێناو بەرقەرار کردنی ئەم پەیماننامەیەدا.

١٠- نابێت هیچ قوڕەیشی و هاوپەیمانێکیان لەناو شاری مەدینە پەنا بدرێن.

١٢- هەموان دەبێت پشتیوانی یەکتری بن، دژ بە ئەوانەی هەڵدەکوتنە سەر شاری مەدینە.

١٣- ئەم پەیماننامەیە بەهیچ جۆرێك چاوپۆشی لە ستەمکارو تاوانبار ناکات.

بەدڵنیاییەوە بەستنی ئەم پەیماننامەیە لەگەڵ جولەکەکاندا، شاری مەدینەی گەورەترو بەهێزترکرد لە بەرامبەر دوژمنانی ئیسلامدا، ئەگەر جولەکە لەژێرەوە پەیوەندییان لەگەڵ قوڕەیشیەکان و بێباوەڕانی دیکەدا نەبەستایە بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانان، ئەوا هیچ کات نە خاچ پەرەستان و نە هاوبەش پەیداکەرانی مەککەو نە هۆزە عەرەبەکانی دی، جورئەتی ئەوەیان نەدەکرد ئەو هەموو هێرشانە بکەنە سەر یەکەمین پایتەختی ئیسلامی.

بەلاّم بەپێچەوانەوە دڵسافی و میهرەبانی پێغەمبەریان (ﷺ) بەهەلزانی و دەستبەجێ کەوتنە پیلان گێڕان لە دژی موسڵمانان، لەوە بێئاگا بوون ئەم دەست پێشخەریە ئاشتیانەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ جولەکەکانی مەدینە لەسەرچاوەی بەهێزی موسڵمانانەوە بووە نەك بەپێچەوانەوە، شیاوی باسە سێ هۆزی جولەکە لەناو مەدینەدا دەژیان ئەوانیش بریتی بوون لە هۆزەکانی (بنو قینقاع، بنو نضیر، بنو قریظة).

## جولەکە واز لە خیانەت و فرت و فێڵ ناهێنێت

ئەمەیە پەرۆشی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ چەسپاندنی ئاشتی لەگەڵ جولەکەکانی مەدینەدا، سەروەرمان پەرۆشی ئەوە بوو هەتا خەڵکی مەدینە لەسایەی یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامیدا بحەوێنەوەو ئومێدەوار بوو جولەکەکان دەست لە مێژووی ڕەشی خۆیان لە دژایەتی کردنی پێغەمبەران و ئاینی خوادا هەڵبگرن، بەڵام بەداخەوە ئەوان بەئاشکراو بەنهێنی کەوتنە دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان و پێشێلکردنی خاڵەکانی ڕێکەوتنەکە، بە ئامانجی لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان و خودی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ).

لێرەدا بەکورتی چەند هەڵوێستێکی جولەکەتان بۆ دەگوازینەوە لە دژایەتی کردنی موسڵماناندا، وەك:

"ابن اسحاق" دەڵێت: "شاس" ی کوڕی "قیس" یەکێك بوو لە جولەکە زۆر بەتەمەن و زۆر داخ لە دڵەکان لە دژی ئیسلام و موسڵمانان و بەردەوام حەسودی بە موسڵمانان دەبرد.

جارێکیان بەلای کۆمەڵە موسڵمانێکی هۆزی "ئەوس" و "خەزرەج" دا تێپەڕی کە بەئاشتی و برایانە دانیشتبون و خەریکی وتووێژ بوون ، دەست بەجێ سەردەمی پێش هاتنی پێغەمبەری (ﷺ) بۆ مەدینە بیرکەوتەوەو کاتێك ئەوان ئەم دوو تیرەیان دەدا بەگژ یەکداو هەزاران کەسیان لەیەکتری

دەکوشت، کاتێك بینی ئەو دوو تیرەی مەدینـە لـە ئێـستاداو لـە سـایەی ئیسلامدا بونەتە برا، زۆری پێ ناخۆش بوو، لەبەر ئەوە گووتی: ئەوە خێڵـی "قیله"ن لەم شارەدا پێکەوە دانیشتوون؟! ئەگەر بەم شێوەیە برایەتییەکەیان بەردەوام بێت ئێمە هیچ شتێکمان بۆ ناکرێت.

لەو کاتەدا ناوبراو گەنجێکی جولەکەی لەگەڵدا بوو، وتی بڕۆ بـۆ لایـان و لەگەڵیان دابنیشەو باسی ڕۆژی(بعاث)یان بۆ بکەو بەخوێندنـەوەی هەنـدێك شیعری ئەو کاتە کوشتاری نێوانیان بیر بخەرەوە، گەنجەکـەش بـەو شـێوازەی کرد کە پێی گوترابوو، ئیدی هۆزی "ئەوس" و "خەزرەج" یش کەوتنە قسە وتن بە یەکتری و شانازی بە هۆزی خۆ کردن و..

دواتر بڕیاریاندا بچنە دەرەوەو هەردوولا بە مەبەسـتی شـەڕکردن چـەك بهێنن، بەپەلە هەواڵ گەیشتەوە بە پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئەویش لەگـەڵ کۆچ کردواندا چوو بۆ لایان و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بۆ خاتری خـوا تـازە دەچـنەوە بـۆ سـەردەمی نـەفامی؟! لـە کاتێکـدا مـن هێـشتا لەناوتاندام، ئایا دەست دەکەنەوە بە شـەڕ لـە پـاش ئـەوەی خـوای گـەورە ڕێنمونی کردون و بەئاینی ئیسلام ڕێزی لێ گرتن و لە نەفامی ڕزگاری کردن و هەموتانی کرد بەیەك؟ ئیدی خەڵکەکە بۆیان دەرکەوت ئەمە یەکێك بووە لە فێڵەکانی جولەکەو پاشان دەستیان کردەوە ملی یەك و ئاشت بوونەوە .

## بەنو قینقاع، لە هاوپەیمانیەوە بۆ پەیمان شکاندن

کاتێك جوەکانی "بنو قینقاع" بینییان خوای گەورە لە جەنگی بەدردا سەرکەوتنێکی گەورەی بەخشییە موسڵمانان و بەهۆیەوە دەسەلاَت و شانوشەوکەتیان پەیدا کرد، ئیدی زیاتر ڕقیان لە موسڵمانان دەبوویەوەو پێغەمبەریش (ﷺ) بەردەوام هەستی دەکرد جولەکەکان خاوەن پەیمان نین و بۆ فرسەتێك دەگەڕێن تا خەنجەری خیانەت و بێ پەیمانی لە موسڵمانان بدەن.

لەگەڵ سەرکەوتنی موسڵماناندا لە جەنگی بەدردا، شەڕو ئاژاوەیان لە دژی موسڵمانان زیاتر بو و بەردەوام گاڵتەیان پێدەکردن و تەنانەت بێ شەرمییان گەیشتە ئاستی شەڕفرۆشتن بە ئافرەتە موسڵمانەکان، "بنو قینقاع" نیشتەجێی شاری مەدینە بوون، زۆربەیان زەڕەنگەرو وەستای قاپ و قاچاغ بوون، ئەم هۆزە لە ئازاترین جولەکەکانی مەدینە بوون، خاوەنی حەوسەد کەسی شەڕکەر بوون و، یەکەمین تاقمی پەیمان شکێنی جولەکە بوون، زۆرجار پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری دەکردن و داوای لێ دەکردن دەست لەو کردەوە چەپەڵانەیان هەڵبگرن و ئەوانیش دەیان گوت: محمد شەڕێکی لە قورەیشیەکان بردوەتەوەو لەخۆی بایی بووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر پەنای بۆ گفتوگۆ کردن دەبرد لەگەڵ جولەکەکاندا، تا کێشەکان چارەسەر بکرێن و بە ناڕەوا دژایەتی موسڵمانان

نەکەن، بەڵام ئەوان ڕۆژ بە ڕۆژ لوت بەرزترو شەڕەنگێزتر دەبوون.

"ابن اسحاق" دەفەرمووێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شەڕی بەدردا بەسەر قوڕەیشیەکاندا سەرکەوت، دوای گەڕانەوەی بۆ مەدینە، جولەکەکانی لە بازاڕی "بنو قینقاع" دا کۆکردنەوەو فەرموی: خێڵی جولەکە ملکەچ بن پێش ئەوەی ڕووداوێکی هاوشێوەی قوڕەیشیەکانتان بەسەردا بێت؟

ئەوان لەوەلاّمدا گوتیان: ئەی "محمد" لە خۆت بایی مەبە بەوەی چەند پیاوێکت لە قوڕەیش کوشتووە؟! ئەوان هەرزە بوون و شەڕیان نەدەزانی، ئەگەر شەڕمان لەگەڵدا بکەیت، ئینجا دەردەکەوێت خەڵکی شەڕکەر ئێمەین، تۆ تا ئێستا شەڕت لەگەڵ خەڵکی وەك ئێمەدا نەکردووە، ئەوەبوو پەروەردگار چەند ئایەتێکی ناردە خوارەوەو داوای لە جولەکەکان کرد پەند لە شکستی قوڕەیشییەکان وەربگرن و موژدەی دۆزەخ و شکستی پێدان لە حاڵەتی شەڕکردنیان بەرامبەر موسڵمانان.

بەڵام"بنو قینقاع"عاریان نەگرت و بەردەوام بوون لە دژایەتی کردنی موسڵماناندا، پێغەمبەریش(ﷺ) لەبەرامبەر پەیمان شکێنی ئەواندا ئارامی گرت و پاش ماوەیەك ئیدی بەدەستی خۆیان مەرگیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

ئەمە پاش ئەوە دێت وەك ئیبن هیشام لە"ابی عون"ەوە ڕوداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: جارێکیان ئافرەتێکی موسڵمان شمەکی هێنابوو لە بازاڕی"بنو قینقاع" فرۆشتی و لای کابرایەکی زەڕەنگەر

دانیشت و پاشان چەند جولەکەیەك داوایان لێی کرد دەموچاوی دەربخات، ئەویش ڕەتی کردەوە، دواتر زەڕەنگەرەکە لایەکێ کراسی ئافرەتەکەی بەستەوە بەپشتییەوە، بەبێ ئەوەی ژنەکە ئاگای لێ بێت و لەگەڵ هەستانەوەیدا عەورەتی دەرکەوت و جولەکەکانیش کەوتنە گاڵتە کردن پێی؟!

ئافرەتەکە هاواری لێهەستاو پاشان موسڵمانێك جوەکەی کوشت و موسڵمانەکەش بەدەستی جولەکەکانی تر کوژراو کەس و کاری پیاوە موسڵمانەکە هانایان بردە لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئیدی لێرەوە شەڕ لەنێوان موسڵمانان و جولەکەکانی "بنو قینقاع" دا دەستی پێ کرد.

سوپای موسڵمانان بەسەرکردایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو "بنو قینقاع" بەڕێکەوت، دواتر لەترسی موسڵمانان، جولەکەکان چونە ناو قەڵاکانیان و بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ ئابڵوقە دران، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە چاوپۆشییەوە فەرمانی دەرکرد بەوەی دەبێت مەدینە چۆڵ بکەن، ئیدی ڕویان کردە ناوچەکانی "أذرعات" ی شام.

## "کەعبی کوڕی ئەشرەف"یش ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەدات

کەعبی کوڕی ئەشرەف یەکێکە لەو جولەکانەی زۆر ڕقی لەخواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەبوویەوە، ناوبراو لەهۆزی (بنو نضیر) بوو، ئەو بەدەوڵەمەندترین و جوانترین و خۆش مەشرەب ترینی عەرەب ناو دەبرا، بەردەوام هیوایەتی بریتی بوو لە ڕابواردن و بۆنی خۆش لەخۆدان و کەیف کردن وەك خۆی دەڵێت: جوانترینی ئافرەتەکانی عەرەب لەلای منە؟!

ئەم پیاوە ناپاکە کاتێك هەواڵی بەدرو سەرکەوتنی موسڵمانانی بیست زۆر نارەحەت بوو، بە زمان و شیعرە پیسەکانی کەوتە جنێودان بە موسڵمانان و ووتی: ئەو قورەیشیانەی بەدەستی محمد کوژراون، بەڕاستی پیاو ماقوڵ و سەرکردەی عەرەب بوون، ئەگەر محمد ئەوانی کوشتبێت، ئەوا ژێر زەوی و مردن بۆ ئێمە باشە..

ئیدی لێرەوە دەستیکرد بەهۆنینەوەی شیعرە جنێو ئامێزەکانی بەپێغەمبەرو (ﷺ) باوەڕداران، بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك شەرم لەوە بکات، ئەوان پەیماننامەی ئاشتییان لەگەڵ باوەڕداراندا مۆر کردووە، تەنانەت هەر بەوەشەوە نەوستاو هەستا لەبەر چاوی موسڵمانانەوە سواری وولاخ بوو، بەرەو مەککە کەوتە ڕێی و لەوێ بەدەم هۆنینەوەی شیعرووەوە دەستی کرد بە گریان شین و شەپۆڕ کردن لە بۆ کوژاوانی هاوبەش پەیدا کەران و هانی دەدان بۆ نوێکردنەوەی ڕق و کینیان لەدژی ئیسلام و موسڵمانان و دەوڵەتە

تاقانەکەی یەکتاپەرەستی.

ئەو بەردەوام داوای ئامادەکاری لێ دەکردن بەئاراستەی هەڵگیرساندنی جەنگی تۆڵە کردنەوە لە موسڵمانان، پاشان ئەم بێ شەرمە بەو حاڵەوەو بەبێ ترس گەڕایەوە بۆ مەدینە، موسڵمانان و پێغەمبەر (ﷺ) دەیانزانی چ شتێك کەعبی بردوەتە مەککە، بەڵام هەر سەبارەت بە سەرەڕۆییەکانی کەعب دانیان بەخۆیاندا گرت، لەبەرامبەردا ئەم ناپاکە لەگەڵ ئەوەی باش دەیزانی سەدان جار پەیمانەکەی لەگەڵ موسڵمانان هەڵوەشاندوەتەوە، بەڵام هەر بەردەوامی دەدایە ناپاکییەکانی بەرامبەر موسڵمانان و خودی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، تا کار گەیشتە ئەوەی کەوتە جنێودان بەئافرەتانی باوەڕدارو بەو زمانە پیسەی خەریکی ئازاردانیان بوو.

ئارام گری موسڵمانان بەرامبەر کردەوە شەرم ئامێزەکانی کەعب لەسنور دەرچوو! ئیدی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ دەتوانێت کەعبی کوڕی ئەشرەف لەناوبەرێت؟ پاڵەوانی ئیسلام و بەرپرسی دەستەی پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش (محمد) ی کوڕی (مسلمە) بوو فەرمووی: ئەی پێغەمەری (ﷺ) من ئامادەی جێبەجێ کردنی ئەو کارەم، دواترو بە هاوکاری چەند هاوەڵێکی تر لەڕێی داڕشتنی نەخشەیەکەوە توانییان لە کەعب نزیك بکەونەوەو پاشان ئەم جولەکە ناپاکەیان لە کۆڵی پێغەمبەرو (ﷺ) باوەڕداران کردەوە.

## هۆزی (بنو نضیر) و هەوڵە شکست خواردوەکەیان بۆ شەهید کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

پێشتر بەکورتی باسی داخ لە دڵی ئەم گەلە پیسەمان کرد، لـە بەرامبـەر ئیسلام و موسـڵمانانداا؟ چـونکە ئـەوان ئومێـدەورابون پێغەمبـەری ئـاخیر زەمان لەخۆیان بێت، دوای ئەوەی بینییان لـەناو عەرەبەکانـدا هەڵکـەوت، ئیدی ئەو ڕاستییەیان هاتە پێش چاو کە لەمەودوا دەسـەلاتیان بەدەسـتەوە نامێنێت و بەهۆی ئەو پێغەمبەرەوە (ﷺ) عەرەبەکان دەبنە خاوەنی شکۆ و دەسەلات، پاش ئەوەی سەدان ساڵ لە زیللەتدا ژیـاون و بەدەسـتی شـەڕو ئاژاوەی جولەکەکانەوە گیرۆدە بوو بوون.

پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین هیچ کات جولەکە خاوەنی ئەو شەهامەت و پیاوەتییە نەبوون ڕاستەوخۆ بێنـە مەیـدان و شـەڕی موسـڵمانان بکـەن، بەڵکو بەردەوام پەنایان بۆ ئاژاوەو شەڕی لابەلا بـردوەو لەڕێگـەی هانـدانی ئەم و ئەوەوە، ئاگری ئاژاوەو خوێن ڕشتنیان خۆش کردوە.

جولەکە لەدوای ڕووداوی (بنو قینقاع) و کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف زۆر لـە موسـڵمانان دەترسـان و بەتایبـەت لـە دوای لەکۆڵکردنـەوەی ئـەم ناپاکەوە، بەتەواوی زراویان چوو بوو، بەلام کـە شـەڕی "ئوحـود" ڕوویـداو بەچاوی خۆیان شکستی موسڵمانانیان بینی، ئیدی ئەم ڕووداوەیان بەفرسەت زانی هەتا پیلانەکانیان چـڕ بکەنـەوە بـۆ دژایـەتی کردنـی موسـڵمانان و، پەیوەندی ژێریـەژێریان لەگـەڵ دووڕوان و هاوبـەش پەیداکـەرانی قوڕەیـشدا

بەست و کەوتنە کارکردن لە بەرژەوەندی دوژمنانی ئیسلام، گومان لەوەدا نیە ئەوان ئارامگری و دڵسافی موسڵمانانیان بەهەلزانی و هەوڵی شەهیدکردنی پێغەمبەریانداو (ﷺ) ڕوداوەکەش بەم شێوازە بوو:

پێغەمبەر (ﷺ) بە یاوەری چەند هاوەڵێك چون بۆ لای جولەکەکانی (بنو نضیر)، بەمەبەستی پێدانی خوێنبایی ئەو دو پیاوەی خێڵی (کیلاب) کە لەلایەن (عمر) ی کوڕی (امیە) وە بە هەڵە کوژرا بون، ئەمەش دەبوە ئەرك لەسەر جولەکەکان بەپێی بەندەکانی پەیاننامەکە، پاشان جولەکەکان وتیان: باشە (أبوالقاسم) لێرەدا دابنیشە تا کارەکەت بۆ جێ بە جێ دەکەین؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپاڵ دیوارێکی ماڵە جولەکەیەکدا دانیشت، چاوەڕێی جولەکەکانی دەکرد تا لەسەر وادەی خۆیان پارەکە بهێنن، هەریەکە لە ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەرو ئیمام عەلی و چەند هاوەڵێکی دیکەی لەگەڵ دانیشتبوون، پاشان جولەکەکان دەستیان کرد بەسرتە سرت و بڕیاریاندا بەردێکی گەورە بەسەر سەری پێغەمبەردا (ﷺ) بەربدەنەوەو شەهیدی بکەن!

هەرچەندە (سلام)ی کوڕی (مشکم) جولەکە بو و لە مەترسی و ناپاکی کارەکەیان ئاگاداری کردنەوەو پێی ڕاگەیاندن: ئەمەی ئێوە دەیکەن پەیمان شکێنییە لەنێوان ئێمەو موسڵمانانداو پێی ڕاگەیاندن کارەکەتان سەر ناگرێت، خوای پەروەردگار پێغەمبەر(ﷺ) لە کارە چەپەڵەکەتان ئاگادار

دەکاتەوە، بەڵام بەگوێیان نەکردو لەسەر خیانەتەکەیان پێداگرییان کرد.

ڕاستەوخۆ جبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەرو (ﷺ) پیلانی جولەکەکانی پێ ڕاگەیاند، بەخێرایی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو شوێنەی بەرەو مەدینە بەجێ هێشت و هاوەڵانیش بەدوایدا ڕۆیشتن و وتیان: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی هەستایت، ئەویش پیلانی جولەکەکانی بۆ باس کردن، پاشان (محمد) ی کوڕی (مسلمە) بەنوێنەرایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوە لای جولەکەکان و مۆڵەتی "دە" ڕۆژی پێدان هەتا مەدینە جێ بهێڵن، بەپێچەوانەوە ئەگەر لەو ماوەدا مەدینە چوڵ نەکەن، ئەوا هەمویان دەبێت بکوژرێن.

جولەکەکان بەناچاری دەستیانکرد بەخۆ کۆکردنەوە بۆ چۆڵکردنی شاری مەدینە، بەڵام لەژێرەوەو بەنهێنی سەرۆکی دووڕووان پەیوەندی پێوە کردن و داوای مانەوەو دەرنەچون و بەرگری کردنی لێ کردن و بەڵێنی پێدان و گوتی دوو هەزار سەرباز دەنێرمە ناو قەڵاکانتان تا بەرگریتان لێ بکەن و ناوبراو پێشی وتن: ئەگەر ئێوە دوچاری شەڕو ماڵ وێرانی ببن بەدەستی موسڵمانان، ئەوا هاوپەیمانەکانیشتان لە (قریظة) و (غطفان) بێ دەنگ دانانیشن.

سەرئەنجام ووتەکانی سەرۆکی دووڕوان، جولەکەکانی (بنو نضیر)ی دوچاری لوتبەرزی کردو بڕیاری مانەوەو بەرگرییان هەڵبژاردو بێمنەتی خۆشیان بەرامبەر موسڵمانان ڕاگەیاند؟! بێگومان سوپای موسڵمانان حەزی بەشەڕو بارگژی نەدەکرد، بەتایبەتی هێشتا جەستەی موسڵمانان سارێژ نەبوو بوو، لەدەرئەنجامی خوێنی بەناحەق ڕژاویان لە کارەساتی بیری

(معونە) دا حەفتا هاوەڵی سنگ پڕ لە قورئـان، بـەناوی بانگـەوازکردن بـۆ ئاینی ئیسلام و پاش دوورخستنەوەیان لە مەدینـە بەنامەردانـە شـەهیدیان کردن.

بۆ جەنگی جولەکەکانی (بنو نضیر) سوپای موسـڵمانان بەسـەرکردایەتی پێغەمبەری (ﷺ) بەرەو ناوچەکە بەڕێکـەوت، جولەکـەکانیش بـەرەو نـاو قەلاّکانیان پاشەکشەیان کردو دەستیانکرد بە بەرد گرتنە موسڵمانان، پـاش ئابڵوقـەدانێکی "٦ – ١٥" ڕۆژی و، دوای ئـەوەی بۆیـان دەرکـەوت هـیچ کەس بە سەرۆکی دوو ڕووەکانیشەوە نەهات بەدەنگیانەوە، ئیدی بەناچـاری بڕیاری چۆڵکردنی ناوچەکەیاندا.

لە بەرامبەردا پێغەمبەر(ﷺ) ڕەزامەندی دەربڕی کەلوپەلی پێویـستی خۆیان لە ولاّخەکانیان بار بکەن و بارگەو بنەیان بگوازنەوە بـۆ ناوچـەکانی دەرەوەی سـنوری موسـڵمانان بەمـەرجی نـەبردنی چـەك وپێداویـستییە سەربازیەکانیان و بەجێهێشتنیان بۆ سوپای موسڵمانان.

## (بنو قريظه) ش چووە پاڵ ئەحزاب

بەئاوڕدانەوەمان بۆ لاپەڕەكانی مێژوو ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەكەوێت بەردەوام كاری سەرەكی جولەكە خیانەت و كاولكاری و ئاژاوەنانەوە بووە، بەهۆی ئەم هەڵوێستانەشیانەوە بەردەوام بەشیان زیللەت و ئاوارەیی و سەرگەردانی بووە.

بۆ ئەو مەبەستەو بەئامانجی ئاژاوەگێڕی و كردنەوەی بەرەیەكی بەرفراوانتری جەنگ لەدژی موسڵمانان، بیست كەس لە سەركردەكانی جولەكەو پیاوانی (بنو نضير)ی لە وڵات دەركراو، بەرەو شاری مەككە كەوتنە ڕێ، سەرئەنجام قوڕەیشیان ئاڕاستەكرد بۆ دوبارە هەڵگیرساندنەوەی جەنگی دژە موسڵمانان..

قوڕەیش خوازیاری دەرفەتێكی ئەوتۆ بوون، تا ناوبانگی ونبووی خۆیان بكڕنەوە، دواتر چونە لای هۆزی (غطفان) و هەمان پیلانیان بەوان گەیاندو ئەوانیشیان فریودا، پاشان بەناو هەموو هۆزە عەرەبەكانی ناوچەكەدا گەڕان و هاوپەیمانی زۆریان بۆ ئەو مەبەستە دروست كرد، بەم شێوازە سەركردەكانی جولەكە سەركەوتن لەكۆكردنەوەو جۆشدانی بێباوەڕان بەئاڕاستەی كوژاندنەوەی ئاینی یەكتاپەرەستی.

هۆزەكان لەكاتی دیاری كراوی خۆیانداو بە "دە" هەزار سەربازەوە بەرەو مەدینە بەڕێكەوتن و دواتر گەمارۆی شارەكەیاندا، بێگومان پێش جولە پێكردنی سوپاكان، پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری جم و جوڵ و بەرنامەو

مەرامەکانیان بوو، لەبەرئەوە بەردەوام لەگەڵ ئەنجومەنی شوراو راپرسی هاوەڵاندا تاووتوێی بارودۆخەکەیان دەکردو، سەرئەنجام باشترین نەخشە بۆ رووبەڕووبونەوەی دوژمنان نەخشەی سەلمانی فارسی بوو، ناوبراو پێشنیاری هەڵکەندنی خەندەقی کرد لە باکوری شاری مەدینەدا.

دەستبەجێ بەرنامەی هەڵکەندنی خەندەق دانرا بەشێوەیەك دەبوو هەر "دە" پیاو چل گەز خەندەق هەڵبکەنن، موسڵمانان بەخێرایی کەوتنە هەڵکەندنی خەندەقەکەو پێغەمبەریش (ﷺ) لە پرۆسەکەدا وەك ئەوان بەشداری دەکردو تا لەو ساتانەدا هاوەڵان بەسکی برسی خەریکی خەندەق هەڵکەندن بوون، تا لەو ساتە ناسکەدا لەناکاو پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی سەرکەوتن و تێپەڕاندنی ئەم قەیرانەو لەناوبردنی هەردوو دەوڵەتی فارس و رۆمی لەسەر دەستی موسڵمانان راگەیاند..؟!

پێش گەیشتنی سوپا بۆ شاری مەدینە، خەندەقەکە تەواوکرا، کاتێك سوپای هاوبەش پەیداکەران چاویان بەخەندەقەکە کەوت، جگە لە گەمارۆدانی شار هیچ چارەسەرێکی تریان دەستنەکەوت، هاوبەش پەیداکەران زۆر هەوڵیاندا رێگەیەك بدۆزنەوە بۆ دزەکردنە ناو شاری مەدینەوە بەلام بێ سود بوو، لەبەرئەوە موسڵمانە تیرهاوێژەکان لەدوری خەندەقەکەدا دامەزرا بوون و هەرکەسێ هەوڵی پەڕینەوەی بدابایە، دەستبەجێ تیربارانیان دەکردو، چەندین جار ئەم رێگەیان تاقی کردەوە بەلام سەرکەوتوو نەبوون.

لەبەرئەوە بەدوای چارەسەرێکی دیکەدا دەگەڕان، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، یەك لە بەندە گرنگەکانی نێوان پێغەمبەری خواو (ﷺ) جولەکەکان بریتی بوو لە بەیەکەوە بەرگری کردن لە مەدینە لە حاڵەتی هێرشی دوژمناندا، لێرەوە ئیدی تاوانباری هۆزی (بنو نضیر) کە "حیی" کوڕی "أخطف" بوو، چوو بۆ ناو ماڵەکانی (بنو قریظة)، بەمەبەستی هەوڵدان بۆ پەشیمان کردنەوەی (کعب) ی کوڕی (أسد القرظي) تا لە قوڵی ئەوانەوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، جێی وەبیر هێنانەوەیە (کعب)ی کوڕی (أسد القرظي) ئیمزاکەری پەیماننامەکەو هاوکات سەرۆکی جولەکەکانی (بنو قریظة) بوو، بەڵێنی دابوو بە پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی دروستبونی مەترسی لەسەر مەدینە ئەویش ببێتە پارێزەری شارەکە شان بەشانی موسڵمانان.

بێگومان ئەم پیاوە کەسێکی خراپ نەبوو، سەرەتا زۆر بەتوندی دژی پێشنیارەکەی (حیی) کوڕی (أخطف) وەستایەوەو بە خیانەتی دەزانی پەیماننامەکە لەگەڵ موسڵمانان هەڵبوەشێنێتەوە، لە کاتێکدا موسڵمانەکان کەمترین پێشلکارییان دژی بەندەکانی پەیماننامەکە نەکردووە، بەلام ئەم ناپاکە هەر وازی نەهێناو لەکوڵی نەبویەوەو پاش ئەوەش چەندین جار دەرگاکەی بەسەردا داخستەوەو ڕۆیشتە ماڵەوە، سەرئەنجام (کعب) ڕازی بوو بەهەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە، بەمەرجی ئەوەی ئەگەر قوڕەیش و هۆزەکان بەبێ زیان گەیاندن بە موسڵمانان لەشەڕەکەدا شکستیان هێنا، (حیی) یش لەگەڵ (کعب) دا بچێتە ناو قەڵاکانی (بنو قریظة) وە، بۆ ئەوەی وەك یەك

زیانیان بەر بکەویّت؟! ئیدی لیّرەوە (بنو قريظة)ش چوونە ڕیزی هاوبەش پەیداکەرانەوەو بەکردەوەش چەندین کاری سەربازییان لە دژی موسڵمانان لەو بارودۆخە پڕ لە مەترسیەدا ئەنجامدا.

کاتیّك ئەم هەواڵە بە پیّغەمبەرو (ﷺ) موسڵمانان گەیشت، پیّغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ دڵنیابون لەو هەواڵە وەفدیّکی دوو کەسی ڕەوانەی لای جولەکەکان کردو ئەوانیش بەدەم قسەوتنەوە ڕایانگەیاند هیچ پەیمانیّك لەنیّوان ئیّمەو ئیّوەدا نیە!.

بە ڕاستی ساتەوەختیّکی زۆر ترسناك بوو بۆ موسڵمانان و، قورئان زۆر بەجوانی ئەو ساتە پڕ لە مەئاساتەی موسڵمانان دەخاتە ڕوو وەك دەفەرموویّت: ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ ﴾[1].

تەنانەت هاوەڵان دەفەرموون: کاتیّك بەتەواوەتی پیّغەمبەر (ﷺ) پەیمانشکیّنی جولەکەکانی پیّ گەیشت، لە ترسناکی دۆخەکەدا پۆشاکەکەی دا بەسەر خۆیداو بۆ ماوەیەك ڕاکشا؟! پاشان هەستایەوەو فەرمووی (الله أكبر) و موژدەی سەرکەوتنی بەموسڵمانان ڕاگەیاند؟

دواتر خوای گەورە ڕیّنمونی دۆستیّکی قورەیش و جولەکەکانی کرد،

---

[1]– الاحزاب:١١،١٠.

ئەویش (نعیم) ی کوڕی (مسعود) بوو، بەنهێنی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواو(ﷺ) بەحەزی خۆیی و لەسەر ڕاسپاردەی پێغەمبەر (ﷺ)، کەوتە نێوانیانەوەو سەرئەنجام بەچەند نەخشەیەکی ژیرانە، ڕێکەوتنی نێوان جولەکەو ئەحزابی لەباربرد.

بەو شێوەیە پەروەردگار نزای پێغەمبەرو(ﷺ) موسڵمانانی گیرا کردو پاش پەرت کردنی سوپای دوژمنان، خوای گەورە لە شەوێکی تاریکدا زریانێکی توندو ساردو باراناوی بۆ ناردن و ڕەشماڵ و خێمەکانیان با بردی، بەتەواوی سەرماو زریان شپرزەی کردن و بەسەری شۆڕو پەرتەوازەییەوە مەدینەیان بەجێ هێشت و سەرئەنجام خوای گەورە موسڵمانانی لەو جەنگەشدا سەرخست؟!

دوای پەرتەوازە بونی سوپای هاوبەش پەیدا کەران و جێهێشتنی مەدینە، پێغەمبەریش (ﷺ) هاتەوە ناو شارو لەو ساتە وەختەدا (جبریل) هاتە خزمەتی فەرمووی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە چەکەکەت داناوە، خۆ هێشتا فریشتەکان چەکیان دانەناوەو من نوێنەری ئەوانم هاتومەتە لات، هەتا هەر ئێستا بەخۆت و سەربازانی ئیسلامەوە بەرەو (بنو قريظة) بکەونە ڕێ، منیش لەپێشتەوە دەڕۆم و ترس و بیم دەخەمە دڵیانەوە؟!

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بڕیاریدا نوێژی عەسر ببەنە ناوچەی (بنو قريظة) و دوای چەند ڕۆژێك لە گەمارۆدانیان، ناچار بڕیاری خۆبەدەستەوەدانیانداو سزاکەشیان سەربڕینی پیاوەکان و بەخشینی ژن و

منداڵەکانیان بوو.

هاوکات لەگەڵ دەرکردنی جولەکەکان لە مەدینە، هەندێکیان ڕوویان لە شام کردو لەوێ نیشتەجێ بوون، بەشێکیشیان ڕوویان لە ناوچەکانی خەیبەر کرد.

خەیبەر شارێکی گەورەی پڕ لە قەلاّبوو، دانیشتوانی بەکاری کشتوکاڵی و باخدارییەوە خەریك بوون، (٦٠-٨٠) میل لەشاری مەدینەوە دوورە، دەمێك بوو پێغەمبەری خواو (ﷺ) موسڵمانان هەستیان بەوە کردبوو خەیبەر بووەتە جێگەی نەخشەو پیلانی جولەکە بۆ دژایەتی کردنی دەوڵەتی ئیسلامی، ئەمە جگە لەوەی هەستابوون بە پەنادانی پاشماوەکانی (بنو نضير) و (بنو قينقاع)، هەمان کات دانیشتوانی ئەم شارە لە جولەکەو خێڵەکانی نەجد پێکهاتبوون، بیریشمان نەچێت هەر جولەکەی خەیبەر بوون هەموو ئەحزابیان لە دژی موسڵمانەکان کۆکردەوەو هانی (بنو قريظة) شیاندا بۆ پەیمان شکێنی.

خۆشەویست (ﷺ) دەیویست خۆی یەکلا بکاتەوە بۆ بەرقەرار کردنی ئاشتی لە ناوچەکەدا، هەتا دانیشتوانەکەی پاش هەموو ئەو شەڕانە ماوەیەك پشوو بدەن و دەستکراوەتریش بێت بۆ گەیاندنی پەیامی خوایی بە ناوچەکانی دیکە، دڵنیاش بوو لەوەی ئەگەر گورزێکی ئاسنینیان لێ نەوەشێندرێت، ئەمانە بەردەوام دەبن لە پیلانەکانیان.

گومان لەوە نیە ڕزگاربونی موسڵمانان لە شەڕی ئەحزاب و مۆر کردنی

سوڵحی حودەیبیە دەرفەتێکی باش بوو تا ئەم ئاژاوەچییانەی دەوری مەدینە تەمێ بکرێن، پێغەمبەر (ﷺ) دەمێك بوو نیازی لەناوبردنی جولەکەکانی خەیبەری هەبوو، بەڵام سەرەتا مەبەستی بوو یەکەمینی دوژمنەکانی کە قورەیش بوون بخات بەلایەکدا، بێ گومانیش ئیمزا کردنی سوڵحی حودەیبیە لاوازی قورەیشیەکانی بەئاشکرا دەرخست و گەورەترین شکستی سیاسی بوو کە بەهۆیەوە قورەیشیەکان دوچاری شکستی یەکجاری بونەوە.

ئیدی دوای ئەو ڕێکەوتنە پێغەمبەرو (ﷺ) موسڵمانان بەفرسەتیان زانی و بۆ ئەو مەبەستەو لە موحەڕەمی ساڵی حەوتی کۆچیدا سوپا بەرەو ناوچەکانی خەیبەر بەرێکەوت، پاش گەیشتنی سوپای ئیسلامی و لە بەرەبەیانێکدا خەڵکی بە پاچ و بێڵەکانیانەوە بەرەو مەزراکانیان دەڕۆیشتن، سوپای ئیسلامی دای بەسەریانداو ماوەی چەندین ڕۆژ ئابڵۆقەدران و، پاش ئازادکردنی قەلا سەرەکیەکان، ئیدی خۆیان داوای گفتوگۆیان لەگەڵ موسڵماناندا کردو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن ژن و منداڵ و هەندێك پێداویستی لەگەڵ خۆیاندا ببەن و ناوچەکە بۆ موسڵمانان چوڵ بکەن.

## پیلانێکی شکست خواردو بۆ شەهید کردنی پێغەمبەر (ﷺ)

پێغەمبەر(ﷺ) لە خەیبەر بۆ ماوەیەك مایەوە، زەینەبی کچی حارس، خێزانی (سلام) ی کوڕی (مشکم) بوو، مەڕێکی سورەوە کراوی بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێشتر ئەم ئافرەتە پرسیاری کردبوو سەبارەت بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لە چ جۆرە گۆشتێکە، بۆی دەرکەوتبوو خۆشەویست (ﷺ) حەزی لە ڕانی مەڕە، ئیدی ژەهرێکی زۆری پێوە کردبوو، ئەمە جگە لەوەی بەشەکانی تریشی ژەهراوی کردبوو، کاتێك مەڕەکە هێنرایە بەردەم پێغەمبەری خوا (ﷺ)، سەرەتا دەستی بۆ ڕانەکە برد پارچەیەك گۆشتی خستە دەمی و بۆی قوت نەدراو تفی کردەوەو فەرموی: ئەم پارچە گۆشتە هەواڵی ژەهراوی بونی خۆی پێدام؟!

زەینەب بانگ کراو دانی نا بەتاوانەکەیدا، کاتێك هۆکاری ئەنجامدانی کارەکەیان لێ پرسی، ژنەکە گوتی: لەدڵی خۆمدا وتم: ئەگەر ئەم پیاوە پادشایەکی دونیایی بێت لێی ڕزگار دەبین و، ئەگەریش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت ئەوا ڕزگاری دەبێت و سەبارەت بەو کارەی من ئاگادار دەکرێتەوە؟!

ئیدی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی خۆش بوو، هەندێك گێڕانەوەش دەڵێن، لەو کاتەدا (بشر)ی کوڕی (براء) لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووەو، پێش پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارچە گۆشتێکی خواردوەو شەهید بووەو پێغەمبەریش (ﷺ) ئافرەتەکەی لە بەرامبەردا کوشتوەتەوە، زانایان

سەبارەت بە لێخۆش بوون یاخود کوشتنەوەی ژنەکە لەسەر ئەوە یەکدەنگن، پێغەمبەر (ﷺ) یەکەمجار چاوپۆشی لێکردووە، بەلاّم کە (بشر) وەفاتی کردوە لە تۆڵەیدا کوژراوەتەوە.

## کەمینەکان و ڕۆڵیان لە کەوتنی دەوڵەتی (ئەندەلووس)ـدا

لە کاتێکدا ئەندەلوس لەلایەن موسڵمانانەوە فەتح کرا، خەڵکەکەی لە مەسیحی و کەمینەی جولەکە پێکهاتبوون، موسڵمانەکان زیاتر لە هەشت سەدە بەباشترین شێوە حوکمی وولاّتی ئەندەلوسیان کردووە.

بێگومان هیچ کاتێك موسڵمانان وەکو داگیرکەرو چەوسێنەر هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دانیشتووانی ئەندەلوسدا نەکردووە، بە پێچەوانەوە بەردەوام سوپای ئیسلامی پارێزەری سەروماڵ و سەروەت و سامانیان بووە، هیچ کات زۆریان لێ نەکراوە خۆیان گوتەنی بۆ ئەوەی واز لە ئاینی باب و باپیرانیان بهێنن، بەپێچەوانەوە زۆرترین ئازادی و سەربەستییان پێدراوە لە ڕووی بیروباوەڕەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فراوانی ئازادی بیروڕا لە ئیسلامدا، ئەندەلوس ئەوکاتە دەکەوتە ڕۆژئاوای دەوڵەتی ئیسلامییەوە.

مێژونووسان حوکمڕانی موسڵمانان بۆ ئەندەلوس بە زێڕینترین سەردەم دادەنێن لە مێژووی ئەو ناوچەیەدا، جێی ئاماژەیە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، دەوڵەتی ئیسلامی خۆش گوزەرانی بۆ دانیشتوانی ئەندەلوس بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان موسڵمانان و کەمینە مەسیحییەکاندا فەراهەم

کردبوو، ئەمە جگە لەوەی بە هەوڵ و کۆششی دەوڵەتی ئیسلامی، ئەندەلوس هەنگاوی گەورەینا بەرەو پێشکەوتن، بەئەندازەیەك شاری (قرطبة) ی پایتەختی ئەندەلوس لە پێشکەوتن و گەشەو بەرەو پێشچونیدا لە ڕووی بیناسازیەوە بەراورد دەکرا بەشاری (قسطنطينية) ی پایتەختی دەوڵەتی بیزەنتی.

تا ئێستاش پاشماوەی ئەو پێشکەوتنە ماوە کە موسڵمانان ئەنجامیاندا بەئاراستەی بەرەو پێش بردنی ئەو وڵاتە لە هەموو ڕووەکانەوە، ئەوە مزگەوتی (ئەمەوی) یە لە شاری (قرطبة)، تا ئێستاش بەگرنگترین و گەورەترین مزگەوت دێتە ئەژمار لەسەر ئاستی جیهانیدا.

بە نەرمو نیانی هەڵسوکەوت کردنی سوپای ئیسلامی لەگەڵ خەڵکی ئەندەلوسدا هۆکاری سەرەکی بوو بۆ موسڵمان بوونی زۆربەی دانیشتووانەکەی، بەبێ ئەوەی کەسێك زۆری لێکرابێت تا ئاینی خۆی بگۆڕێت و بەزۆر موسڵمان بکرێت..! ئیدی بەهۆی ڕەوشت جوانی سوپای ئیسلامییەوە لەگەڵ دانیشتوانی ئەندەلوسدا، زۆربەی خەڵکەکەی موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاندو بەم هۆیەشەوە مەسیحییەکان بوونە کەمینە لە وڵاتداو، هاوکات و لەگەڵ بەکەمینە بوونی مەسیحییەکاندا، بەڵام لەژێر ئاڵای ئیسلامدا زۆر بەخۆشی و دڵنیاییەوە ژیانیان دەبردە سەر، کەرامەت و سەروەت و سامانیشیان لەژێر سێبەری حکومەتی ئیسلامیدا پارێزراو بوو.

هەروەك لە ناوچەو کۆمەڵگا گەورەکانی ئەندەلوسداو بەتایبەت لە ناوچەکانی (قرطبة، اشبيلية، طليطلة، بلنسية، سرقسطة..) دا کەمینەی مەسیحی نیشتەجێ بوون و لەلایەن خەلیفەی موسڵمانانەوە زۆر ڕێزیان لێ دەگیراو هەروەك زۆرێکیان لە کۆشك و شوێنە گرنگەکاندا بەرپرسیاریەتیان وەرگرتبوو، ئەم پێچەوانەیە پێویست ناکات بخرێتە بەر ڕۆشنایی بیرو باوەڕی (الولاء والبراء) لەنێوان موسڵمانانندا، هەروەك ئەمە ڕێگر نیە لە گرتنی هاوڕێ لە نێوان غەیری موسڵمانانندا.

هێشتا دەوڵەت و خیلافەتی ئەمەوی لە ئەندەلوسدا شکستی نەهێنابوو، بەربەرو سەقالیبەکان دەستیان کرد بەبلاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن و زۆرداری، چەندین دەوڵەتی تەوائیفی شوم لە دژی ئیسلام و موسڵمانان سەریان هەڵدا، لێرەوە ئیدی گۆڕانکاری دروست بوو سەبارەت بە ژیان و بارودۆخی کەمینەکان، بەشێوەیەك سودیان وەرگرت لە ئازادییەکی ڕەها، بەرپرس و پاشای هۆزەکان گرنگی زۆریان بە کەمینەکان دا، هەروەك هەوڵی زۆریاندا بۆ دڵنیاکردنەوەی کەمینەکان و پارێزگاری کردن لێیان و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی کەمینەکان.

پاشاکانی(قرطبة، اشبيلية، سرقسطة) لە پێشبڕکێدا بوون بەمەبەستی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی کەمینەکان، هەروەك سیاسەتی ڕازی کردنی کەمینەکان زۆر ڕون و ئاشکرایە، لەبەرئەوەی ئیسپانیای مەسیحی لەو سەردەمەدا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە ئەندەلوسداو بەتایبەت لەو

ناوچانەی موسڵمانەکان تیایدا باڵادەست بوون، هەروەك چەند هێرشێك لەلایەن ئیسپانیەکانەوەو بە سەرکردایەتی (ألفونسو) ی شەشەم کرایە سەر موسڵمانەکان بەناوی شەڕی (أسترداد)، ناوبراو پاش داگیر کردنی (طليطلة)، گومانی وەهابوو دەتوانێت بەئاسانترین شێوە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە داگیر کردنی (سرقسطة) شدا، بەڵام بەپشتیوانی خوای گەورە (ألفونسو) لەناوچەی زەلاقەدا دوچاری شکست بوویەوەو نەیتوانی (سرقسطة) داگیر بکات.

بەردەوام سەرۆك هۆزەکان ترسیان لەو کەمینانە هەبو و بەسەرچاوەی ئاژاوەو مەترسییان دەزانین بۆ دەسەڵاتیان،"بنو عیباد" پاشای (قرطبة) بوو، زۆرترین لێبوردنی دەنواند لەبەرانبەر کەمینەکاندا، پادشاکانی تر وەك "عبداللەی کوڕی بەلقین"، لەلایەن مەسیحییەکانەوە پشتگیری دەکرا، بەهەمان شێوە لەلایەن سوارچاکەکانی مەسیحییەوە پشتگیری دەکرا، هەروەك ئەم پادشایە ئامۆژگاری دەکراو بە هەموو شێوازێك یارمەتی ئەدرا لە جەنگەکانیدا لە دژی موسڵمانان.

هەروەها "ئیبن هود" لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەندەلوسدا بوو، ناوبراو لەناو پادشای هۆزەکاندا زۆرترین چاوپۆشی بەرامبەر کەمینەکان هەبوو، پشتی بە هاوپەیمانیەتی مەسیحییەکان دەبەست لە هەموو پیلانێکیدا دژی موسڵمانان.

پێویستە بزانین (کیمبیادور) پاڵەوانێکی فارسی مەسیحی بوو، بوو

بەگەورەترین کارەسات بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوسداو ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە داگیر کردنی (بلنسیە) داو ناوبراو ناکۆکی نێوان کاربەدەستی شارەکە و (مرابط)ەکانی بەهەلزانی بۆ داگیر کردنی شارەکەو، سەرئەنجام پاش گەمارۆدانێکی بیست مانگی توانی لە "١٥-حوزەیرانی ١٠٩٤" ی زاینی بچێتە ناو (بلنسیة) وە، لەو ساتەوە (بلنسیة) لەژێر دەستی (کیمبیادور) دا مایەوە تا ئەو کاتەی لە ساڵی "١٠٩٩" ی زاینی کۆچی دوایی کرد، پاشان هاوسەرەکەی (شیمان الصمود) کەوتە بەرگری کردن بە ئاراستەی وەستاندنی هێرشی (مرابط) بۆ سەرشاری (بلنسیة) و سەرئەنجام لە حوزەیرانی ساڵی "١١٠٢" ی زاینیدا (مرابط)ەکان چوونە ناو شاری (بلنسیة) وە.

(کیمبیادور) بەردەوام هاوکارو هاوپەیمانی (ألفونسو) ی شەشەم بووە لە لێدانی موسڵمانان و هێرشکردنە سەر ناوچەکانی ئەندەلوس، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین هەتا ئێستاش (کیمبیادور) لەنێو پاڵەوانەکانی ئیسپانیادا بە گەورەترین پاڵەوان دێتە ئەژمار.

بەڵێ کەمینەکان لەژێر سایەی دەوڵەتی موسڵماناندا لە ئەندەلوس لە خۆشترین ساتەکانی ژیانیاندا بوون، هەمیشە لەخۆشگوزەرانیدا بوون و بەردەوام دەوڵەتی ئیسلامی پارێزەری مافەکانیان بووە، لەبەرامبەر خزمەت و چاکەکانی دەوڵەت بۆ کەمینەکانی ئەندەلوس، بە هەموو پێوەرێك دەبوو ئەو کەمینانە خۆشەویستی و پشتگیری خۆیان بۆ کۆمەڵگاو دەوڵەتە

ئیسلامییەکەی دەربڕن! ئەوان بەرامبەر ئەم هەموو چاکەو سنگ فراوانیەی دەوڵەتی ئیسلامی دەبوو پاڵپشتی دەوڵەتی ئیسلامی بونایە، بەلاّم مەخابن نمەك حەرام و سپڵەو بێ وەفا دەرچوون و سەرئەنجام کەوتنە نانەوەی ئاژاوەو نەخشەو پیلان و ژەهر ڕشتن لە دژی دەوڵەتی موسڵمانان لە ئەندەلوسدا !!.

بە دڵنیاییەوە لەم پیلانانەدا مەسیحییەکان هاوکارێکی سەرەکی کەمینەکان بوون، هەروەك پادشای هۆزەکانیش هاوکارییان کردون، بەداخەوە هیچ کات کەمینەکان بەو ڕۆحیەتەوە هەڵس و کەوتیان نەکردووە کە ئەوان بەشێکن لە کۆمەڵگای ئیسلامی ئەندەلوس و ئەوەیان لەبەر چاو نەگرتووە بەردەوام ئەو دەوڵەتە قوربانی داوەو خوێنی سەربازە موسڵمانەکان ڕژاوە لەپێناو پاراستنی سەرو ماڵی کەمینەکاندا.

هیچ کات ئەمانە پشتیوانی خۆیان بۆ دەوڵەت دەرنەبڕیوەو، بەپێچەوانەوە بەردەوام چاویان لەوە بووە چ کاتێك دەرفەتیان بۆ بڕەخسێت تا خەنجەری بێ وەفایی و خیانەت لە دەوڵەتی ئیسلامی بدەن، هەروەکو لە پیلانەکانیاندا لەلایەن پادشاکانی ئیسپانیای مەسیحییەوە بەردەوام هاوکاری کراون بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی، دەربارەی ئەمە گەلێك نموونەمان لەبەردەستدان کە دەیسەلمێنن ئیسپانیەکان بە هەموو شێوازێك هاوکاری و پاڵپشتی کەمینەکانی ئەندەلوس بوون لە بۆ دژایەتی کردن و ڕوخاندنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە، ئەمانەی خوارەوەش چەند نمونەیەکن لەو بارەیەوە:

أ- گەمارۆدانی(قلمریة) لە ساڵی "٤٥٦" ی کۆچیدا لەلایەن

مەسیحیەکانەوە:

هەروەك لەم پیلانەشدا کەمینەکان ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە یارمەتیدانی ئیسپانیەکاندا، هەروەها قەشە (دیر) کە لە (قلمریة) نزیك بوو، هەستا بە کارئاسانی کردن و هاوکاریکردنی سوپای ئیسپانیەکان بۆ گرتنی (قلمریة) و سەرئەنجام ئەو ناوچەیە لەلایەن خاچ پەرستەکانەوە داگیرکرا.

ب- کەوتن و داگیر کردنی (طلیطلة) لە ساڵی "٤٧٨" ی کۆچیدا:

بە مردنی (ئەمیر عبدالرحمنی دووەم) لە "٤"ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی "٢٣٨"ی کۆچی، ئەندەلوس و ناوچەکە ڕووبەڕووی قەیرانی گەورەو پێکدادانی سیاسی بویەوە، هۆکاری ئەمەش لاوازی کاربەدەستان بوو لە ئاراستەکردن و بەڕێوەبردنی ناوچەکانداو نەدەتوانرا "مەرکەزیەت" لە جێبەجێکردنی بڕیارەکاندا بچەسپێنرێت، ئەمە سەرباری ئەوەی ناوچەکە لەپێش فتوحاتی ئیسلامیدا پێگەیەکی گرنگی مەسیحییەکان بوەو لەگەڵ کەوتنی دەوڵەتی ئەمەویەکاندا لە ساڵی "٤٢٢" ی کۆچیدا، گیانی جیاخوازی و پەرتکردنی(طلیطلة) دەستی پێکرد، پاش ماوەیەکی کەم ئەم دیاردەیە هەموو ناوچەکانی ئەندەلوسی گرتەوە، هەرلەبەرئەوەیە هەندێك لە مێژوونوسان ئەم ماوەیە بە سەردەمی مەمالیکەکان ناو دەبەن، بەشێوەیەك لە ئەندەلوسدا بەزمانی ئەمڕۆ "٢٣"دەوڵەتی بچوکی سەربەخۆ هەبوون، تا ئەو ڕادەیەی هەرکەسەو دەستی بەسەر ناوچەیەکدا گرتبو و پێشگری

(پادشا) ی بەناوەکەی خۆیەوە لکاندبوو.

ئەم قۆناغەش هەلێکی دا بەکەمینەکان هەتا مەرامە گلاوەکانیان بەدی بهێنن، ئیدی لێرەوە دەستیانکرد بەدەست تێکەڵ کردن لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا، کەمینەکان لە (طليطلة) بەردەوام لە هەوڵداندا بوون بۆ نانەوەی ئاژاوەو شەڕو پیلان گێڕان لە ناوچەکەدا، بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانیان بەردەوام بەشوێن سەرچاوەی هاوکاریدا دەگەڕان، ئیدی پەنایان بۆ (ألفونسو)ی شەشەم بردو بەردەوام لە پەیوەندیدا بوون لەگەڵ ئەو شەڕەنگێزە سەربازییەدا، ناوبراو سەرۆکی ئیسپانیەکان بوو، هەوڵیدەدا دانیشتوانی (طليطلة) لەدژی دەوڵەتی ئەندەلوس هان بدات و، جۆرێک لە بەرگری لەدژی حکومەتی ئیسلامی بهێنێتەکایەوە، بەو شێوەیە لە پیلانی ڕووخاندن و داگیرکردنی (طليطلة) شدا کەمینەکان دەورێکی بالآیان بینی.

لێرەوە کارەساتی جەرگبڕ ڕووبەڕووی (طليطلة) بوویەوە، لە کاتێکدا یەحیای کوڕی هیشام داوای هاوکاری لە(ألفونسو)ی خاچ پەرست کرد تا بەخۆیی و سوپاکەیەوە هێرش بکاتە سەر شارەکە بەمەبەستی داگیر کردنی، (ألفونسو)ش ئاواتە خوازبوو داخوازییەکی لەو شێوەیەی ئاراستە بکرێت، بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدا بوو پشتگیری کەمینەکان و بەرپرسانی داخ لە دڵی موسڵمانان لە ناوچەکانی ژێر دەستەلآتی حکومەتی ئەندەلوسدا بەدەست بهێنێت بۆ داگیر کردنی ناوچەکان.

دواتر بەسوپای (قشتالة)ەوە هاتە ناوچەکەوەو پاش ئابلۆقەدانی شارەکە،

سەرئەنجام سوپای ئیسلامی لەو شارەدا تێك شكێندراو لەسەر دەستی (ألفونسو) شاری (طليطلة) داگیرکرا، ئەمەش لە ساڵی "٤٧٨" ی کۆچیدا ڕوویدا.

داگیرکردنی(طليطلة)گەورەترین کارەساتە ڕووبەڕووی موسڵمانان و دەوڵەتی ئەندەلوسی ئیسلامی بوبێتەوە لەو سەردەمەدا؟ چونکە(طليطلة) ولاّتی ئەندەلوسی بۆ دووبەش دابەش کردو لە ڕووی جوگرافیشەوە ناوچەیەکی گرنگەو (ألفونسو) بەباشی هەستی بەوە دەکرد داگیرکردنی ئەم ناوچەیە هاندەرێکی باشە تا ناوچەکانی تریش خۆیان بەدەستەوە بدەن، هەمانکات داگیرکردنی (طليطلة) نازناوی ئیمپڕاتۆری هەموو ئیسپانیای دا بە(ألفونسو)ی شەشەم و نازناوی (أمير الملتين) یشی لێ نرا کە مەبەست موسڵمان و مەسیحییەکانە.

ج- جەنگە گەورەکەی ئەندەلووس لە ساڵی "٥١٩" ی کۆچی ڕوویدا: ئەم جەنگە ئەوپەڕی خیانەت بوو لەلایەن کەمینەکانەوە لەدژی دەوڵەتی ئیسلامی ئەنجام درابێت، لەکاتێکدا مەسیحییە هاوپەیمانەکان هەستان بە بانگ کردنی (ألفونسو)، ناوبراو بەهێزترین پادشای خاچ پەرستەکان بوو لەکاتی جەنگ و داگیرکاری ئەندەلوسدا، بەڵێنیان پێدا بوو بەکۆکردنەوەی دەیان هەزار کەس لەوان لە دژی دەوڵەتی ئەندەلوس و، پەیمانیان پێدا بەیارمەتیدانی و پشتیوانی لێ کردنی بەگیان و خوێن.

بەداخەوە (ألفونسو) هەستا بەئەنجامدانی جەنگە بەناوبانگەکەیی و

سەرئەنجام چوونە ناو بنکەکانی ئەندەلوسەوەو دەستیاندایە بلاۆکردنەوەی گەندەڵی و فەساد، هەروەها سەربازانی کەمینەکان چوونە پاڵ هێزەکەی (ألفونسو) لە کاتی ڕۆیشتنی سوپاکەیدا بەناو ڕێگاکان و دەروازەکانی شاردا، بەلاّم بەیارمەتی و پشتیوانی خوای پەروەردگار (ألفونسو) لەو جەنگەدا شکستی هێناو بەبێ ئومێدییەوە گەڕایەوە، ئیدی لەوە بە دوا هیچ بۆ کەمینەکان نەمایەوە جگە لە هەستکردن بە ترسناکی ئەو هەڵوێستە خیانەت کارانەی لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی نواندیان، پاشان دەیان هەزار کەس لە مەسیحییەکان ڕایان کردو (ألفونسو)ش لەگەڵیاندا هەڵهات و ماڵ و سەروەت و سامانەکەشیان بە جێ هێشت.

بەو شێوازە کەمینەکان لە ئەندەلوسدا بوونە مایەی سەرئێشەو نەخۆشی و ئاژاوە بۆ گەل و دەوڵەتی ئیسلامی، سەرەڕای ئەو هەموو یارمەتی و پاراستن و پارێزگاری لێ کردنەی لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە پێشکەشیان دەکرا، بەلاّم سەرئەنجام ئەوان بوونە تاپوری پێنجەم لە بۆ دوژمنان، بێگومان ئەم ڕاستەقینەیە لەلایەن مێژوونووسە خاچ پەرەستەکانەوە بە ئاشکرا دانی پیادا نراوە، لەوانەش (بیدلال) مێژوونووسێکی خاچ پەرەستەو دەڵێت: ئەستێرەی هاوپەیمانەکان جارێکی تر دەرکەوت دوای کەوتنی دەوڵەتی ئەندەلوس و سەرهەڵدانی دەوڵەتەکانی سەر بە هۆزە لاوازەکان و، توانییان خزمەتی گەورە لە بەرژەوەندی خاچ پەرەستەکان پێشکەش بکەن و هەروەك پەرەیاندا بەکردارەکانیان لە هێنانی خاچ پەرەستان بۆ ناوەوەی

وڵات.

بەو شێوەیە لەئەندەلوسدا تا ئەو ئەندازەیە ئازادی بۆ کەمینەکان پەرەی پێدرا، سەرئەنجام دەستدرێژی کرایە سەر موسڵمانەکان و سوکایەتی بە بنەچەیان کرا.

## کەمینەکان و ڕۆڵیان لە هاوکاری کردنی مەغۆڵەکاندا بۆ داگیرکردنی بەغداد.

بەردەوام مێژوونووسەکان داگیر کردنی وڵاتە ئیسلامییەکان لەلایەن مەغۆڵەکانەوە دەگێڕنەوە بۆ هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان جەنگیزخانی پادشای مەغۆڵەکان و عەلائەدین خوارزمی سەرکردەی موسڵمانان لەو سەردەمەدا، بەڵام لە ڕاستیدا هۆکاری سەرەکی داگیرکاری مەغۆڵەکان بۆ وڵاتانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ پیلانە فێڵاویەکانی خاچ پەرەستان کە بەردەوام ترسیان لە ئیسلام و موسڵمانان هەبوەو، بە هەموو شێوازێك خاچ پەرەستان هەوڵی ئەوەیانداوە مەغۆڵەکان لە دژی ئیسلام و لاواز کردن و دژایەتی کردنی موسڵمانان بەکار بهێنن.

لە سەردەمی شالاوی داگیرکارییاندا تەتارەکان بەئەندازەی زیان گەیاندنیان بە موسڵمانان زیانیان بە خاچ پەرەستەکانیش گەیاندووە، بگرە خاچ پەرەستان زۆر زیاتر لە موسڵمانان بەدەستی تەتارەکان کوشتوبڕ کراون، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی تەتارەکان چوونە ناو ماڵی کاسۆلیکە

توندڕەوەکان لە ڕۆما.

لەگەڵ داگیرکردنی هەموو ولاتانی ئەوروپای خاچ پەرەست لەلایەن تەتارەکانەوە، لە بەرامبەردا کاتێك ئەوروپا بۆی دەرکەوت ئەمە شەڕێکی بیروباوەڕی نیە، لە جیاتی بەرگریکردن چونە پاڵ تەتارەکان بەمەبەستی بەدی هێنانی ئامانجەکانیان؟ چونکە بڕوایان وەهابوو ئەم شەڕەی تەتارەکان دەستیانداوەتێ شەڕێکی کاتیە، ئیدی ئەوروپای خاچ پەرەست دڕندایەتی تەتارەکانیان بەفرسەت زانی تا ئەوان بەکار بهێنن بۆ شەڕی موسڵمانان، لێرە بەدوا دەستی خیانەت و خەنجەری ژەهراوی ئەوروپای خاچ پەرەست و بەتایبەت ولاتانی وەك: "ئینگلتەرا، ئاڵمان، فەرەنسا، ئیتاڵیا" وەشێنراو چونە پاڵ تەتارەکان بەمەبەستی لێدانی موسڵمانان.

خاچ پەرەستانی ئەوروپا لەگەڵ ئەو هەموو کارەساتانەی بەدەستی تەتارەکان بەسەریاندا هات لە "داگیرکردنی ولاتیان وکوشتن و سەربڕینی پیاو و منداڵەکانیان و، بەکۆیلە کردن و ئەتك کردنی ئافرەتەکانیان و.."، بەلام هەر ئامادەبوون دەست بخەنە ناو دەستی تەتار بۆ لێدانی ئوممەتی ئیسلامی، وەك دەسپێك بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکان، ئەوروپا زۆربەی سەرکردەکانی تەتاری فێری ئاینی مەسیحی کرد، ئامانجیان لەم کارەش بۆ ئەوە بوو لە قۆناغی پاش داگیرکردنی ولاتی ئیسلامیدا وەك سەرچاوەیەك بەکاریان بهێنن لە بە گاورکردنی ئوممەتی ئیسلامیدا!.

بەدرێژایی مێژوو ئەگەر نەخشە دوژمنکارییەکانی دوژمنان نەبونایە هیچ

هێزێك توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی موسڵمانانی نەدەبوو، بەڵێ لەو کاتەشدا وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا خاچ پەرستان دووبارە کەوتنەوە پیلانگێڕان لە دژی ئیسلام و موسڵمانان، ئەوەبوو نوێنەری خۆیان نارده لای مەغۆڵەکان بەمەبەستی هاوکاری کردنی مەغۆڵەکان بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ لە دژی موسڵمانان و داگیرکردنی ولاتانی ئیسلامی..؟! بەداخەوە خاچ پەرستان هەموو جۆره ئاسان کارییەکیان لە بۆ مەغۆڵەکان کرد تا جەنگ لە دژی ئیسلام و موسڵمانان بکەن و تواناو بەرهەم و دەستهات و تەنانەت بەندەو بەکرێ گیراوەکانی خۆیان خستە خزمەتی مەغۆڵەکانەوە لەپێناو هەڵگیرساندنی ئەو جەنگەدا، مەسیحییە سەرسەختەکانی ئیسلام ئافرەتیان وەك چەك بەکار دەهێناو سەرئەنجام توانییان لەو ڕوانگەوە مەغۆڵەکان لە خشتە ببەن و ئافرەتە خاچ پەرستەکان کاریگەری زۆریان دەکردە سەر مەغۆڵەکان بۆ درێژەدان بە جەنگەکە، مەغۆڵەکانیش بەردەوام لەگەڵ ئەو ئافرەتانە ڕایان دەبوارد، ئیدی هێرشی مەغۆڵەکان بۆ سەر ولاتی ئیسلام بەشێوەیەك بوو تەڕو وشکی بەیەکەوە سوتاند.

لەساڵی "٦٤٠"ی کۆچیدا خەلیفەی موسڵمانان لە بەغداد کۆچی دوایی کرد، ئەو کات خەلیفە (مستنصیر باللە) بوو، دواتر کوڕەکەی کە ناوی خەلیفە (مستعصم باللە) بوو هاتە شوێنەکەی، ناوبراو لەو کاتەدا تەمەنی "٣٣" ساڵ بوو، کەسێکی ڕەوشت بەرزو قورئان خوێنی دور لە سیاسەت بوو، تا ئەو ڕادەیەی هیچی لە سیاسەت نەدەزانی، ئیدی ڕێگە بۆ

دەوروبەرەکەی خۆش بوو لە بەچکە مەسیحی و ڕافیزەکان کاروبـاری وولاّت بگرنە دەست و سەرئەنجام لە سەردەمی ئەم خەلیفەیەدا خیلافەت دەروخێـت و شاری بەغداش وێران دەکرێت.

ئێستا تەتارو خیلافەتی عەباسی لە عێراق تـەنها سـنوریکی زۆر باریـك ماوە لەنێوانیاندا، بێگومان لـە باشـوری ئـەو وولاّتـەوە دەوڵـەتی شـیعەی ئیسماعیلی هەیە، بەردەوام زۆر ناپـاك و پـڕ مەترسـی بـوون بـۆ ئوممـەتی ئیسلامی، هەمیشە دەستیان لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام تێکەڵ بوو، لـەپێناو ڕوخاندنی خیلافەتی ئیـسلامیدا چـەندین جـار لەگـەڵ تـەتارەکان پـەیمانی لێدانی خیلافەتیان مـۆر کـرد، تـەتارەکانیش وەك هـەر داگیرکـارێکی تـر بەرژەوەندی خۆیان هەیەو پێیان خۆش نیە دەوڵەتێکی تر هەبێت لـە خۆیـان بەهێزتر بێت، هەتا نەبێتە لەمپـەڕ لەبـەردەم بـەدی هـاتنی ئامانجەکانـدا، لەبەرئەوە تەتارەکان هـەر لـەبیری ئەوەشـدا بـوون کـەی ئـەو ڕۆژە بێـت و دەوڵەتی سەفەویش بڕوخێنن.

بەکورتی (کیوکی کوڕی ئۆکیتای خان) دەسەلاّتی گرتە دەست و لەماوەی فەرمان ڕەوایی خۆیدا سنوری قەڵەم ڕەوی تـەتارەکانی زۆر بـەرفراوان کـرد، لەگەڵ ئەوەی تەتار نەیدەتوانی ئیدارەی هەموو ناوچـەکانی بکـات و، ئـەو سەردەمەش کەس لە موسڵمانان بیری لەوە نـەدەکردەوە ڕاپـەڕین و شـۆڕش دژی تەتارەکان ئەنجام بدات! ئەمەش دەگەڕایەوە بـۆ دڕنـدەیی تـەتارەکان و تەنانەت ئەگەر بۆیان بلوایە نەیاندەهێشت خەڵکی هەناسـەش بـدەن، پـاش

ئەوەی(کیوك) هێزی پێویستی لەبەردەستدا بوو، دواجار بڕیاریدا هێرش بۆ سەر وولاّتان بوەستێنێت تا بتوانێت ئیدارەی ئەو شوێنانە بکات کە دەستی بەسەردا گرتوون.

ئەمەیشی وەك سیاسەتێکی ئەو سەردەمە بەکارهێناو مەبەستی بوو تا ئەو ناوچانە لەڕووی ئیدارییەوە ڕێکنەخات، هێرش نەباتە سەر ناوچەیەکی دی؟ هەتا بەتەواوی لەوە دڵنیابێ ئەو کاربەدەستانەی لە ناوچەکەدا داینانون بەتەواوی بتوانن ڕووبەڕووی هەر شۆڕش و خۆپیشاندانێك بوەستن کە لە دژیان دەکرێت، ئەو مەبەستی بوو لەو ڕووەوە فەوزاو نائارامی نەیەتە کایەوە لە ناوچەی قەڵەم ڕەوی خۆیدا، هەروەك بەم هۆیەوە ناوچەکە ماوەیەك ئارامی بەخۆیەوە بینی، سەرەڕای ئەو هەموو کاولکارییەی ڕویدا.

بەکورتی لەساڵی "٦٤٦" ی کۆچی (کیوکی کوڕی ئۆکیتای خان) کۆچی دوایی کرد، دوای خۆی سێ کوڕی بەجێهێشت، هەرسێکیان بەهۆی کەمی تەمەنیانەوە بۆ گرتنە دەستی دەسەلاّت نەدەگونجان، ناچار خێزانی (کیوك) دەسەلاّتی گرتە دەست و زۆربەی سەرکردە سەربازییەکانی تەتار بەو کارە ڕازی نەبوون، دەیانگوت: نابێت وولاّتێکی وا گەورە بکەوێتە دەستی ئافرەتێك و بڕوایان وەها بوو ئەو سنورە بەربلاّوە پێویستی بەکەسێکی دڵڕەق هەیە بیبات بەڕێوە، دواتر ئەنجومەنی نیشتیمانی تەتار لە ساڵی "٦٤٩" ی کۆچیدا خێزانی (کیوك)یان لەفەرمانڕەوایی خست و (منکۆ خان) یان هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە گەورەی وولاّتی تەتار.

بێ گومان هەڵبـژاردنی (منکـۆ خـان) بـۆ سـەرۆکی تـەتار بەتـەواوەتی نەخـشەی هـەموو جیهـانی گـۆڕی، بیرکردنـەوەکانی ئـەمیش هاوشـێوەی بیرکردنەوەکانی (جەنگیزخان) بـون، بـەردەوام بـیری لـەوە دەکـردەوە چـۆن خیلافەتی عەباسی بڕوخێنێت و بەتەواوەتی وولاتی موسڵمانان داگیر بکات، بـۆ ئـەم مەبەسـتە کەسـێکی هەڵبـژارد هـەتا ببێتـە یارمـەتی دەری لـە کاروبارەکاندا کە ناوی (هۆلاکۆ) بوو و هاوکات برای خۆیشی بوو.

هۆلاکـۆ کەسـێکی خـوێن ڕێـژو دڕنـدە بـوو زۆر ڕقـی لـە موسـڵمانان دەبوویەوەو خاوەنی هیچ بەهایەکی مرۆڤانـە نـەبوو، تـەنها هیـواو ئـاواتی شەڕو خوێن ڕشتن بوو، هۆلاکـۆ بـەئاواتی چـەندین سـاڵەی خـۆی گەیـشت ئەویش پاش ئەوەی کرایە فەرماندەی سەربازی لە ناوچەکانی وولاتی فارس، ئەو بەهەمان نەفەسەوە خۆی ئامادە کرد بۆ داگیر کردنـی شـاری بەغـدادو ڕووخاندنی خیلافەتی عەباسی، لە ڕاستیدا هۆلاکۆ بۆ ئەم کارەی گەورەترین توانای کۆکردەوەو توانی باشترین ڕێگـا بگرێتـە بـەر بـۆ داگیرکردنـی ئـەو وولاتەی کە مێژوو نوسان زۆر بە سەرسامییەوە باسی دەکەن.

هۆلاکۆ بەتـەواوەتی خـۆی ئامـادەکرد بـۆ ئـەو جەنگـەو هێـزی باشـی کۆکردەوە، ئەگەر کاردانەوەی موسڵمانان بەو لاوازییە بێت ئەوا هەر دەبێت (منکۆخان) و سوپاکەی سـەربکەون، بەدڵنیاییـەوە سـوننەتی پـەروەردگار وەهایەو هەرکەس هۆکارەکانی سەرکەوتن بگرێتە بەر سەردەکەوێت تەنانەت ئەگـەر ئـەو کەسـە کـافرو بـێ بـاوەڕیش بێـت؟ چـونکە ئـەوە سـوننەتی

پەروەردگارەو گۆڕانیش لە سوننەتی پەروەردگاردا ڕونادات، هەروەك قورئـان دەفـــەرموێت: ﴿ اسْتِكْبَارًا فِي الْأَرْضِ وَمَكْرَ السَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾[10].

هەرکەسێکیش خۆی بۆ جیهادو ڕووبەڕووبونەوە ئامادە نەکات، بـا ئـەو کەسە موسڵمانیش بێت ئـەوە بێگومـان شکـست چـاوەڕوانیەتی، هـەروەك خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ ﴾[11].

[10]- فاطر:٤٣.

[11]- هود:١٥.

## کۆکردنەوەی هێز بۆ گرتنی شاری بەغداد

لەساڵی "٦٤٩" ی کۆچیدا هۆلاکۆ زۆر بەباشی دەستی کرد بە ئامادەکارییەکانی بۆ داگیرکردنی شاری بەغداد، ناوبراو خاوەنی سەبرو ئارامییەکی لە ڕادەبەدەر بووە لە گرتنی شاری بەغداد دا، بۆ ئەوەی بتوانێت زۆر بەباشی بچێتە ناو خاکی عەباسیەکانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو سەربازو دەسەلات و هێزەی هەیبوو بەلام پێنج ساڵی ڕەبەقیش ئارامی گرت لە گرتنی بەغداد دا، لە ساڵی "٦٤٩" بۆ ساڵی "٦٥٤" بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر خەریکی خۆ ڕێکخستن و ئامادەکاری بوو بۆ گرتنی بەغداد و ڕماندنی خیلافەتی عەباسی.

هۆلاکۆ لە قۆناغی یەکەمدا دەستیکرد بە چاککردنی هەموو ڕێگا نزیکەکانی وولاتی چین بۆ عێراق، هەمانکات هەموو پردە ڕوخاوەکانیشی چاك کردنەوە، ئەمەش لەپێناو بەئاسان تێپەڕ بوونی سوپای تەتارو دروست نەبوونی کێشە بۆیان ، وە سوپای تەتار لە ژمارەدا زۆر بوو، هەروەك عەرەبانەی زۆر گەورەی دروست کرد لە بۆ گواستنەوەی دەبابەو مەنجەنیق و کەرەستە سەربازییەکانی ئەو سەردەمە.

لێرەوە تەتار دەستی کرد بەدروستکردنی پەیوەندی سیاسی و گفتوگۆ کردن لەگەڵ ئەو هێزانەی کە لە ناوچەکەدا لە خۆیانەوە نزیك بوون، ئەوەی باسی دەکەین بۆ یەکەمین جارە لە مێژووی خۆیدا تەتار پەنا بباتە بەر ڕێکەوتنی سیاسی لەگەڵ هێزەکانی تردا ؟

چونکە پێشتر تەتار هیچ بایەخی بەخەڵکانی تر نەدەدا، بەڵام لە ئێستادا لەبەر بەرژەوەندی سیاسی خۆی ئامادەی گفتوگۆ و ڕێکەوتنە، ئیدی لێرەوە کەش و هەوای خەنجەر وەشاندنی ژەهراوی کەمینەکانی عێراق و وڵاتی شام لە دژی موسڵمانان خۆش بوو، لەو ڕێکەوتنانەش تەتارەکان ئەنجامیان دان وەك:

منکۆخان هاوپەیمانی لەگەڵ پاشای ئەرمینیا کە ناوی (هەیسوم) بوو بەست، لەسەر ئەو بنەمایەی تەتار چی ووت ئەرمینیا بڵێت بەسەرچاو، بەمەش دەڵێن سیاسەتی دواکەوتن، ئەمە لە کاتێکدایە ئەرمینیا دووجار لەلایەن تەتارەکانەوە داگیرکراوە، (هەیسوم) دەیزانی دراوسێکانی دیکەی خۆی ووڵاتانی ئیسلامین، بەڵام وەهای بەباش دەزانی لەگەڵ ئەم تەتارانە ڕێك بکەوێت و لە موسڵمانەکانی پێ باشتر بوون و هەروەك دوژمنایەتییەکی زۆر قوڵی لەگەڵ موسڵمانان هەبوو.

پادشای ئەرمینیا مەبەستە سەرەکیەکەی ڕوخاندنی خیلافەتی عەباسیەکان بوو، کارێکی لەو شێوەیەش سودی بە قەڵەمڕەوی (هەیسوم) دەگەیاند، سەرئەنجام (هەیسوم) خۆی ڕۆیشت بۆ لای (منکۆخان) و بەشێوەیەکی حەکیمانە لەلایەن (منکۆخان)ەوە پێشوازی لێ کراو لە ئاهەنگێکدا (منکۆخان) ناوی پادشای بەخشییە (هەیسوم)، هاوکات چەندین پەیمان و دیاری گرانبەهاشی بەخشییە(هەیسوم)، بێگومان تەتارەکان لە لاوازییاندا نەبوو هاوپەیمانییان بەست لەگەڵ ئەرمینیایەکی

بچوکدا، بەڵکو دووربینییان بۆ ڕووداوەکـان پاڵنـەری ئـەم ڕێکەوتنـە بـوو، هۆکاری هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ئەرمینیا لەلایەن تەتارەوە دەگەڕێتەوە بـۆ چەند خاڵێك وەك:

* تەتارەکان دەیان ویست لە شەڕی موسڵمانانـدا سود لە ئەزمونی دەیان ساڵەی ئەرمەنەکان وەربگرن، بەپێویـستیان دەزانـی ئـەوان ڕۆشـنکەرەوەی ڕێگا بن لە داگیرکردنی وڵاتی موسڵماناندا.

* (مـنکۆخان) باش ئەو ڕاستییەی دەزانی کە لـە ناوچـەکانی عێـراق و وڵاتی شامدا خاچ پەرەستان نیشتەجێ بون و لـە وڵاتـی ئیـسلامدا زۆر بـە ئازادی دەژین، مەبەستی بوو پادشای ئەرمەنەکان بەکار بهێنێـت، تـا وەك نوێنەری تەتار بچێتە لای کەمینە خـاچ پەرەسـتەکانی نیـشتەجێی وڵاتـی ئیـسلامی، بەمەبەسـتی لـەژێرەوە ڕێککـەوتن بـۆ هەڵگەڕانـەوە لـە دژی موسڵمانان لەکاتی هێرشی تەتارەکاندا؟ چونکە دڵنیابوو پادشای ئـەرمینیا دەتوانێت قەناعەت بەکەمینە خاچ پەرەستەکانی ناو وڵاتی ئیسلامی بکات تا هاوکاری تەتاربن لە داگیرکردنی وڵاتی ئیسلامیدا.

* ئەگەر جێگایەك زۆر مەترسیدار بوایە بۆ جەنگ لەگـەڵ موسـڵمانان، تەتار سوپاکەی خـۆی پـێش نەدەخـست بـەڵکو سـوپای ئـەرمینیای پـێش دەخست، بەم شێوەیە تەتار لە جەنگی موسڵماناندا سوپای ئەرمینیای کردە قەڵغان بۆ پاراستنی سوپاکەی خۆی.

* منکۆخان زۆر حەزی دەکرد هاوپـەیمان بـۆ خـۆی زیـاد بکـات، لـەو

پێناوەدا حەزی لەنزیك بونەوەو ڕێکەوتن دەکرد لەگەڵ خاچ پەرەستەکانی عێراق و وولاتی شامدا، ئەمەش بۆ ئەوەبوو کەمترین بەرگری ڕووبەڕوو ببێتەوە لەلایەن موسڵمانانەوەو لەکاتی ڕووخاندنی خیلافەتی عەباسیدا، ئەو مەبەستی بوو خاچ پەرەستەکانی ناو وولاتی موسڵمانان لە لێدانی سوپای ئیسلامیدا هاوکاریان بن، گرنگترینی ئەو دەوڵەت و ئیمارەتانەی لەو ناوچانەدا هەبوون وەك: (أنتاكيا، عكا، صيدا، طرابلس)، تەتار بەئاشکرا پێی گوتن: ئەگەر من لە خیلافەتی عەباسیم داو موسڵمانان ویستیان لە شامەوە هێرش بهێنن، ئێوە لەلای خۆتانەوە ببنە بەربەست لەبەردەم موسڵمانانداو ڕووبەڕوویان ببنەوە، ئەگەر ئێوە لەو ناوچانەدا ئەم کارەمان بۆ بکەن، ئەوا ئێمەی تەتار بەڵێنی بەخشینی قودستان پێدەدەین؟!

هۆی هاتنە کایەی ئەو هەموو ڕێکەوتنانە لەنێوان تەتار و خاچ پەرەستانی ناوچەکەدا، (هەیسوم) ی پادشای ئەرمینیا بوو کە وەك سەفیرێکی تەتارەکان لە بەرژەوەندی ئەوان کاری دەکرد.

بیرمان نەچێت زۆرێك لە پادشاکانی شام ئەو داوایەی تەتاریان ڕەت کردەوە، تەنها پادشای ئەنتاکیا نەبێت ناوی "بوهمەند" بوو، ناوبراو بوو بە هاوپەیمانی تەتار؟ چونکە ئەوانی تر باش لەو ڕاستیە گەیشتبوون کە تەتار خاوەنی پەیمان و بەڵێن نیە، هەرکات بیەوێت دەیان فرۆشێت و بێ پارەو بۆ بەرژەوەندی خۆی دەیان بەخشێت.

خاچ پەرەستان باش لەو ڕاستییە گەیشتبون ئەوان لەناو دڵی جیهانی

ئیسلامیدان، چەندە لە تەتار دەترسان، لەبەرامبەردا دوو ئەوەندە ترسیان لە موسڵمانان هەبوو، هەرچەندە بەتەواوەتیش ئەوەیان ڕەت نەکردەوە بەوەی کە لەگەڵ تەتار نین، بەڵکو بەپێکەنینەوە وەڵامێکی چاوەڕوانی ئامێزیان دانەوە بەوەی ئەگەر تەتار سەرکەوت ئەوا لەگەڵیدا دەبن و ئەگەریش شکستیان هێنا، ئەوا ئامادەی ئەوە نین موسڵمانان لەخۆیان تووڕە بکەن؟!

* منکۆخان مەبەستی بوو زیاتر لەگەڵ کەسایەتییەکانی خاچ پەرەستان پەیماننامە ببەستێت؟! چونکە لە کاری سیخوڕیدا سوودی لەم هاوپەیمانانە وەردەگرت، دواجار تەتار بەئامانجەکانی گەیشت لە بەستنی ڕێکەوتننامە لەگەڵ خاچ پەرەستانی ناوچەکەدا، بۆ ئەم مەبەستە پەیمان و ڕێکەوتنی لەگەڵ چەندین کەسایەتی گرنگی ناوچەکەدا بەست، دووبارە (هەیسوم) ی بەکارهێنایەوە هەتا قەناعەت بە خاچ پەرەستانی وولاتی ئیسلامی بکات و مل بدەن بۆ داواکانی تەتار.

لەوانەش کە بونە هاوپەیمانی تەتار وەك خاچ پەرەستانی وولاتی عێراق و شام، پەتریاکی بەغداد ناوی (مەکیکا) بوو لە هەموویان زیاتر بەدەم داواکارییەکەوە هات، ناوبراو بەرپرسی کەنیسەکانی بەغداو سەرۆکی قسیسەکانی عێراق بوو، بێ گومان ئەمانیش ئاسانکاری باشیان لە بۆ تەتار کرد هەتا وولاتی موسڵمانان داگیربکات و لەو ڕووەوە چەندین زانیاری سخوڕی گرنگیان بە تەتارەکان بەخشی.

* هەروەها منکۆخان توانی لەگەڵ مەلیکی (کرژ) لە جۆرجیاو ڕوسیا

ببێتە هاوپەیمان بۆ لێدانی موسڵمانان و ڕماندنی خیلافەتی ئیسلامی، وولاتی (کرژ) یەکێك بوو لە دوژمنە داخ لە دڵەکانی خیلافەتی عەباسی، لەگەڵ ئەوەی تەتار وولاتی (کرژ) ی ڕووبەڕووی ئەو هەموو ماڵ وێرانیە کردبووەوەو بە هەزارەهای لێ سەربڕی بوون، بەلاَم هەر ئامادەبوون بۆ لێدانی موسڵمانان دەستیان لەگەڵ تێکەڵ بکەن، ئیدی بەم پەیماننامەیە مەملەکەتی (کرژ) هاتە ناو بەرەی جەنگی دژە موسڵمانانەوە، واتە بەسەرکردایەتی تەتار سوپایەکی هاوپەیمان پێك هات بۆ ڕماندنی خیلافەتی عەباسی.

ناسر یوسف و بەدرەدین لوئلو دوو کاربەدەستی عێراق بوون، خێرا خۆیان گەیاندە لای هولاکۆ و ئامادەییان دەربڕی بۆ جەنگ کردن دژی خیلافەتی عەباسی، تەنانەت ناسر یوسف، کوڕەکەی خۆی بە چەند هەزار سەربازێکەوە نارد بۆ هاوکاری کردنی تەتارەکان لە داگیرکردنی عێراقدا.

* هولاکۆ توانی خۆی بگەیەنێتە کەسایەتییەکی زۆر دەستەلاَتداری ناو خیلافەتی عەباسی، ئەویش (موئەیەدە دینی کوڕی ئەلقەم)ـە، ناوبراو دووەمین کەسایەتی ناو عەباسیەکان بوو، ئەم پیاوە شیعەیەکی ڕافیزە بوو، بە هەموو شێوەیەك خیلافەتی ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەری لەلا ڕەفز بوو، زۆر ناحەز بوو بەرامبەر ئەهلی سوننەو حەزی لە سەرکەوتنیان نەدەبوو، ئیدی چۆن ئەو پۆستەی وەرگرتووە، بەڕاستی ئەمە جێگای سەرنجە ؟!.

* وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا، تەتار هەتا ئێستا هەر خەریکی ئامادەکارییە بۆ جەنگەکە لە ڕووی ئابوری و سیاسیەوە، لە ئێستاوە بە یارمەتی هاوپەیمان و بەکرێ گیراوەکانی لە وولاتی ئیسلامیدا دەستی کردوە بە بەرپاکردنی گەورەترین جەنگی دەرونی لە دژی سوپای موسڵمانان و خیلافەتی عەبباسی، لەوانەش هۆلاکۆ هەستا بەئەنجامدانی چەندین هێرشی ترسناك بۆ سەر خەڵکی ناوچەکەو دوای ئەوەی زۆربەیانی دەکوشت و سەردەبڕی، دواتر دەگەڕانەوە سەربازگەکانی خۆیان!.

لە جەنگە دەروونییەکانی دیکەشی لەدژی موسڵمانان، بلاوکردنەوەی ماستاوچی و کاسەلێسەکانی بوو بۆ ناوچە جیاوازەکانی ولاتی ئیسلامی و، خەریکی بلاوکردنەوەی درۆ بوون، بەشێوەیەکی خەیالاوی باسی تەتاریان دەکرد، ئەمەشیان بۆ ئەوە دەکرد تا ورەی خەڵکەکە بڕوخێنن و کەس بیر لە بەرگری کردن و جیهاد نەکاتەوە، لە ڕاستیدا ئەم جۆرە شەڕە دەرونیە بۆ دوژمنان بە ئەندازەی هەزارەها سەربازی چاونەترس سودی هەیە؟! چونکە زۆرجار کۆمەڵگا بەم جۆرە پڕوپاگەندانە دوچاری نائومێدی دەبێت و دواتر ئەگەر توانای جەنگیشی هەبێت ناچار خۆی دەدات بەدەستەوە.

پاش تەواو بوونی ئامادەکارییەکان و لە ساڵی "٦٥٤"ی کۆچی هۆلاکۆ بە سەد هەزار سەربازەوە[١٢] بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ، هاوکات لەگەڵ ئەوەی

[١٢]– هەندێك سەرچاوە دەڵێن: ژمارەی سوپاکەی هۆلاکۆ بۆ داگیرکردنی بەغدا دووسەد هەزار سەرباز بووە.

سوپاکەی کامڵترین و پڕ تفاق ترین سوپا بوو، لە ناوەوەی شاری بەغداشەوە بەردەوام لەڕێی کەمینە خاچ پەرەستەکان و بەکرێ گیراوەکانیانەوە زانیاری گرنگی ناو وولاتیان پێ دەدراو سات بەسات دەیانزانی لەناو شارەکەدا چی دەگوزەرێت، بێگومان زۆربەی هەواڵەکانیش لە دەوروبەرەکانی خەلیفەوەو بەخیانەت دەیان گەیاندە تەتارەکان.

* هەموو ئەو هاوپەیمانیەتانەی لە ماوەی ڕابردوودا لە نێوان تەتارو مەلیکە خاچ پەرەستەکان و کەسایەتییەکانی دیکەدا مۆرکراوە، هەریەکەیان لە قوڵێکەوە هاوکاری تەتارەکانیان دەکرد لە گرتنی شاری بەغداد، بۆ نمونە (هەیسوم) ی مەلیکی ئەرمینیا بۆ هاوکاریکردنی تەتارەکان بەسوپایەکی زەبەلاحەوە هاتە ناوچەکەو، مەلیکی (کرژ) یش دەستبەجێ سوپایەکی بۆ هاوکاری تەتارەکان ئامادە کرد، بۆ سەرپەرشتی کردنی دوەمین سوپای سەرەکی، هۆلاکۆ کەسێکی خاچ پەرەستی دانا بەناوی (کەتبگاوین) وە هۆلاکۆ داوای هاوکاری لە مەلیکی ئەنتاکیا کردو ئەویش لەگرتنی شاری دیمەشقدا سوپای خستە خزمەتی هۆلاکۆوە، بەم شێوازە گەورەترین هێز بەڕێکەوت بۆ داگیرکردنی شاری بەغداد.

ئەوەی جێگەی تێڕامانە لە داگیرکردنی شاری بەغداد دا سوپای تەتار زۆر بەهێمنی دەڕۆیشت و وەها خۆی نمایش دەکرد ئەوان ژیان و ژیارێکی نوێ دەهێنن بۆ ناوچەکە، زۆر سودیشیان بینی لە بەکارهێنانی ئەم فێڵە سەربازییە، پاشان لە هەموو لایەکەوە دەرگای چوونە ناو شاری بەغدایان بۆ

کرایەوە، گومان لەوەدا نیە ئەو دەمە شاری بەغداد بەهێزترین شاری دونیا بوو، خاوەنی چەندین دیوارو شوراو قەلآی مەحکەم بوو، ڕاستە دوایـن خەلیفەی عەباسیەکان پیاوێکی باش بووە، بەلآم لەڕووی ئیدارەدان و بەڕێوەبردنی وولآتەوە شارەزاییەکی ئەوتۆی نەبووەو توانای بڕیاردانی نەبووە بۆ چارەسەرکردنی هەر قەیران و ڕووداوێك کە بەرۆکی دەوڵـەتی ئیسلامی دەگرت، ئەمە جگە لەوەی زۆرێك لە دەوروپشتەکەی یان خاچ پەرەست بوون یاخود خائین و بەکرێ گیراوی تەتار بوون.

خەلیفە لە دڵسافی و ساویلکەیی خۆیەوە بەدواداچونی نەکردوە بۆ بەرپرسەکانی دەوروبەری، ئایا ئەگەر خەلیفە هەستی بە بەرپرسیاریەتی بکردایەو لە ئاستی ئەو پۆستەدا بوایە ئەو هەموو پۆستە گەورانەی دەدا بەخاچ پەرەستان و کەسانی شیعەی داخ لەدڵی ئەهلی سوننە؟!

ئەگەر وولآتێك ئەمە خەلیفەکەی بێت و خاچ پەرەستان بهێنێتە ناو کۆشکەوەو بەدڵسۆزیان بزانێت و ڕاوێژیان پێ بکات و بیانکاتە جێگەداری خۆی، بەدڵنیاییەوە بارودۆخی سوپاکەی لە بارودۆخی ناو کۆشکەکەی باشتر نابێت، یەك لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی هۆلاکۆ لە گرتنی شاری بەغداد ئەوە بوو موسڵمانان لەو سەردەمەدا ڕوویان لەخۆش گوزەرانی دونیا کردبوو، هەروەك وازیان لەو جیهادەش هێنا بوو کە بەهۆیەوە لەماوەی ڕابردوودا توانییان ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و فارسەکان بڕوخێنن، باشە خۆ لەو سەردەمەدا سوپای تەتارەکان ژمارەیان سەد هەزار کەس بوو، ئەمە لە

کاتێکدایە لە شاری بەغداد سێ ملیۆن موسڵمان دەژیان، ئەگەر ئەمە باوەش کردن نیە بەخۆشیەکانی دونیادا؟ ئەی دەبێت چی بێت! ئایا ئەمە ترس نیە لە مردن؟ ئایا ئەمە پشت کردن نیە لە جیهاد؟ هەر ئەو هۆکارەشە ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی و موسڵمانانی دوچاری ئەو شکست و زەبونیە کردوەو لەلایەن دوژمنانەوە هیچ ئەرزشێکمان نیە، بەدڵنیاییەوە هیچ گەل و نەتەوەیەك وازی لە جیهادو بەرخودان و سەنگەرنشینی هێنا، تەنها یەك شت چاوەڕوانیانە، ئەویش زەلیلی و زەبونی و کزۆڵی و کوشت و بڕ کردنیان لەلایەن دوژمنانەوە.

ئادەی لە کام سەردەمی ڕابردووی موسڵماناندا ڕویداوە سێ ملیۆن موسڵمان توانای ڕووبەڕووبونەوەی سوپایەکی سەد هەزار کەسی نەبێت، ئەمە هاوکاتی ئەوەیە خیلافەتی عەباسی لەڕووی پارەو سەربازو تەکتیکی جەنگییەوە هیچ هەژار نەبووە، بەلاّم کە ئومەت زراوی چو و پشتی کردە جیهاد، ئیدی چەك و ئەسڵەحەکەیشی بێ سود دەبێت.

چونکە جیهاد تەنها پێویستی بەئامادەکاری سەربازی و ماددی نیە، ڕاستە ئەمانە هۆکاری گرنگی سەرکەوتنن، بەلاّم کۆڵەکە گرنگ و سەرەکییەکەی جیهاد بریتیە لەپەروەردەکردنی ناخ لەسەر بنەمای خۆفرۆشتن بەخوای گەورە، ئایا ئەگەر کەسێك توانای ئەوەی نەبێت چاوی لەئاست سەیرکردنی نامەحرەم دابخات، ئایا ئەگەر کەسێك نەتوانێت نوێژی بەیانی ئەنجام بدات؟ ئایا ئەگەر کەسێك..چۆن دەتوانێت جیهادی بێباوەڕان بکات.

بەكورتی لەو سەردەمەی خیلافەتی عەباسیدا موسڵمانان بە هەموو شێوەیەك ڕوویان لە خۆشگوزەرانی كردبوو، هەركەس بۆ خۆی خەریكی كەسابەت و جەم كردنی ماڵ و سامان و دارایی بوو، وەك ئیبن كەسیر دەڵێت: لە درێژایی ئەو دەمەدا تەتار بۆ ماوەیەكی كاتی شەڕی وەستاند، خەڵكی ئومێدیان وەهابوو چۆن بتوانن سەروەت و سامانی زیاتر جەم بكەن؟! بێ گومان ئەگەر گەلێك مادەو خۆشی دونیای گۆڕییەوە بەسەرخستنی دینی خوای گەورە، بە دڵنیاییەوە بەشی هەر نوشست و شكستە، تا ئەو كاتەی دەگەڕێتەوە سەر شاڕێگەی ئیسلام..

بەكورتی ئەمە بوو بارودۆخی شاری بەغداد، لە ڕۆژی "١٢" ی موحەڕەمی ساڵی"٦٥٦"ی كۆچی لە هەموو لایەكەوە هۆلاكۆ گەمارۆی خستە سەر شاری بەغداد، لە ئێستاوە خەلیفە لەو بارودۆخە ئاگادار دەكرێتەوەو پاشان هەستا بەئەنجامدانی كۆبوونەوەیەكی بەپەلەو لە كۆبونەوەكەدا دوو پێشنیار خرانە بەرباس و لێكۆڵینەوە: (موئەیەدی كوڕی ئەلقەم)ی شیعی خیانەتكار، داوای گفتوگۆو ڕێكەوتنی كرد لەگەڵ تەتارەكانداو، لە بەرامبەردا دوو بەرپرسی دیكەی موسڵمانیش داوای جیهاد و ڕووبەڕووبونەوەیان دەكرد ئەوانیش بریتی بوون لە (موجاهیدەدین ئەیبەك و سەلمان شای یەحچانی).

خەلیفە (المستعصم بالله) بەهۆی ئەوەی لە خیانەتی تەتارەكان دەترسا، لەسەر پێشنیاری ئەو دوو كەڵە پیاوە بڕیاری جیهاد كردنی دەركرد، پاشان

بەشپرزەبییەوە سوپا بۆ جیهاد کۆکرایەوەو (موجاهیدەدین ئەیبەك) کرایە بەرپرسی سوپاکە، بەلاّم ئایا سوپاکە دەتوانێت ڕووبەڕووی سوپایەکی ئامادەکراوی پڕ تفاق و ئەسڵەحەی سەربازی وەك سوپای تەتار بوەستێتەوە؟ سوپا بەرەو دەرەوەی شاری بەغدا بەئاراستەی باکور کەوتە ڕێ، پاشان (موجاهیدەدین ئەیبەك) چاوی بەسوپای بێ شوماری تەتارەکان کەوت بەسەرۆکایەتی (بیجۆ) ئیدی سوپای موسڵمانان بەمەبەستی ڕێگریکردن لەپێشڕەوی سوپاکەی (بیجۆ)، بڕیاری ڕووبەڕووبونەوەیاندا تا ڕێگە بگرن لە هاتنە ناوەوەی سوپاکە بۆ ناو شاری بەغداد.

لە ناوچەی ئەنبار هەردوو هێز ڕووبەڕووی یەك بونەوە، هۆکاری دانانی سوپای موسڵمانان لە ناوچەی ئەنبار بۆ گرنگی ناوچەکە دەگەڕێتەوەو لە ماوەی پێنج سەدەی ڕابردوودا ناوچەیەکی گرنگی سەربازی بووە بۆ موسڵمانان و لەو ناوچەیەدا چەندین سەرکەوتنیان تۆمار کردووە، بەلاّم لێرەوە (بیجۆ) تەکتیکی سەربازی بەکاردەهێنێت و سوپاکەی بەرەو دواوە پاشەکشە پێدەکات و تا سەرئەنجام موسڵمانانی هێنانە جێ مەبەستی خۆیی و دواترو بەهۆی ڕێکەوتنی پێشتری لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەدا، بەنداوێکی گەورەی ئاو بەسەر سوپای موسڵماناندا بەردەداتەوە، ئیدی زۆربەی هەرە زۆری سەربازانی ئیسلامی لەو کارەساتەدا شەهید دەبن و (موجاهیدەدین ئەیبەك) و پاشماوەی سوپاکەیشی بەرەو بەغدا پاشەکشە دەکەن.

(بیجۆ) بەبێ بەرگری بەرەو شاری بەغدا ملی ناو بەئاسانترین شێوە دەستیکرد بەگەماڕۆدانی شارەکە، خەلیفە بەبینینی بارودۆخەکە چاری نەماو ئەلقەمی شیعی بەکرێ گیراویش لەخۆشیدا سمێڵی بریسکەی دەهات، ئەلقەم بۆی دەرکەوت ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بەمەرامی خۆی بگات و لەلایەن تەتارەکانەوە بەڵێنەکەی بۆ جێ بەجێ بکەن، ئەویش ئەوەبوو پەیمانیان پێدابوو پاش ڕماندنی خیلافەتی عەباسی، تۆ دەکەینە مەلیکی وولاتەکە.

بۆ ئەو مەبەستە جارێکی تر ئەلقەم پێشنیاری گفتوگۆی خستەوە بەردەم خەلیفە (مستعصم باللە) ئەویش لە ناچاریدا بەڵێی بۆ پێشنیارەکەی ئەلقەمی خائین کرد، دواتر دووکەس بەنوێنەرایەتی خەلیفە چونە لای هۆلاکۆ بەمەبەستی ئەنجامدانی دانوستان، تۆ بڵێی ئەو دوو کەسە کێ بن؟

وەك ئیبن کەسیر دەڵێت یەکەمیان بریتی بوو لە ئەلقەمی شیعی داخ لە دڵی ئەهلی سوننە، ئەو بەئاوات بوو خیلافەت بڕوخێت و بەئاواتی دووەمی بگات، دووەم کەسیش بریتی بوو لە مەکیکی پەتریاتی خاچ پەرەستەکان، بەو شێوازە شیعەیەك و خاچ پەرەستێك بوونە نوێنەری دەوڵەتی موسڵمانان بۆ دانوستانکردن لەگەڵ تەتارەکاندا ؟! بەبێ گومان ئەم وەفدە شتێك ناڵێن و ئیمزایەك ناکەن ئەگەر لە بەرژەوەندی خۆیان و تەتارەکان نەبێت، یەکەمین پەیامی ئەم وەفدە گەڕاوەیەی لای هۆلاکۆ، بریتی بوو لە شەهید کردن یان تەسلیم کردنی (موجاهیدەدین ئەیبەك و سلێمان شا) بەتۆمەتی ووروژاندنی

گیانی جیهاد لەناو ڕیزی موسڵمانانندا..

بەبەردەوامی مەکیکاو ئەلقەمی شیعی خەریکی هاتووچۆ بوون لەنێوان هۆلاکۆو خەلیفەدا، مەبەستیشیان بریتی بوو لە بەئامانج گەیشتنی خۆیان لەڕمانی خیلافەت و چونە جێگای خەلیفە، خەلیفەی عەباسیەکانیش ئاگای لەم کەین و بەینەی ئەم دوو ناپاکە نەبوو، ئیدی تەتارەکان لەڕێی ئەم بەناو ڕێکەوتنەوە بەبەرنامەیەکی شەیتانی کەوتنە فریودانی خەلیفە تا هەموو ئەو کارانەیان پێ ئەنجامدا کە خۆیان مەبەستیان بوو، لە سەرەتادا دڵنیاییان پێدا بەوەی ئاشتییەکی هەتا هەتایی لەنێوان هەردوولا واژۆ بکرێت.

هۆلاکۆ بۆ پێدانی دڵنیایی بڕیاری مارەکردنی کچەکەی خۆیدا لە کوڕی خەلیفەو هەمانکات ڕایگەیاند خەلیفە لەکورسی حوکمدا دەهێڵنەوە بەمەرجی ئەوەی دەبێت خەلیفە هەموو قەڵاکانی عێراق بڕوخێنێت و سەنگەرە سەربازییەکان پڕ بکاتەوەو هەموو چەك و ئەسڵەحەکانی دەوڵەت تەسلیمی تەتار بکات؟! دووبارە هۆلاکۆ پەیامی ئاشتی بڵاوکردنەوەی بەوڵاتدا دایەوە بەگوێی خەلیفەداو پەیمانی پێدا لەگەڵ هێوربونەوەی بارودۆخەکەدا ناوچەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ خەلیفە، لە سەرەتادا خەلیفە داوای موڵەتی کرد تا بیرێك لە بارودۆخەکە بکاتەوە، پاشان هۆلاکۆ بەبیانوی کەمی کاتەوە گەمارۆکەی لەسەر شاری بەغداد توندتر کردەوە.

لە ڕۆژانی سەرەتای مانگی سەفەری ساڵی "٦٥٦"ی کۆچیدا بۆ ماوەی

چوار ڕۆژ بۆردوومان دەستی پێ کرد، بەم شێوازە بۆردومانەکە هەموو دیوارەکانی ڕۆژهەلاتی بەغدای ڕوخاند، دویارە خەلیفە ڕویکردەوە هاوەلە خائینە بەدۆست تێگەیشتوەکەیی و پێی گوت: چی بکەین؟ ئەلقەمی شیعەیش پێشنیاری کرد خۆی بچێتە لای هولاکۆ، پاش ئەوەی هولاکۆ لە ڕێی ئەلقەمەوەو بە نهێنی هەوالەکەی پێ گەیشت، فەرمانی دەرکرد بەمەرجێ لەگەل خەلیفەی عەباسیەکان دادەنیشێت، دەبێت بۆ ئەنجامدانی کۆبونەوەکە خەلیفە بازرگان و وەزیرو کاربەدەستان و کەسایەتییە گەورەکانی بەغدا لەگەل خۆی بهێنێت، بەبیانوی ئاگادربونی ئەوانیش لە گفتوگۆو ڕێکەوتنەکان.

خەلیفە ناچار ئەم زیللەتەیشی قبول کردو بە زۆر هەموویانی کۆکردەوە بەمەبەستی ڕۆیشتنیان بۆ لای هولاکۆی خوێنڕێژ، سەرئەنجام وەفدێکی حەوسەد کەسی کۆکرانەوە کە زۆریەیان بریتی بون لە زاناو بیرمەندو دەولەمەندەکانی شار، وەفدەکە لەشوێنی حەوانەوەی هولاکۆ نزیك بونەوەو بەلام تەنها ڕێگە بە حەفدە کەس درا بچنە لای هولاکۆ، یەك لەوانەش ئەلقەمی شیعی بوو، ئەوانی تر بەبیانوی دیکەوەو بەزۆر لە وەفدەکە جیا کرانەوەو برانە جێگایەك و سەربڕدران.!

ئەمەیە کردەوی تەتارەکان؟ حەوسەد کەس لەسەر پێشنیاری خۆی بۆ دانوستان هاتوون، کەچی لە بەرامبەردا زۆر بەئاسانی هەموویان دەکوژن!؟ لە مێژوودا ئەمانە خاوەنی هیچ بەهایەکی مرۆڤانە نەبوون.

بەم ڕوداوە خەلیفە بێوەفایی و دڕندەیی تەتارەکانی بۆ دەرکەوت، لێرەوە هۆلاکۆ دەستی کرد بە سەپاندنی بڕیارەکانی بەسەر خەلیفەدا، هەر لەدزینی سەروەت و سامانی بەیتولمالی موسڵمانانەوە بگرە تا کار گەیشتە کوشتنی دوو کوڕەکەی خەلیفەو یەك لە براکانی، بە کەنیزەکیش سێ خوشکی خەلیفەی بردن بۆ خۆیی و هەروەها هەموو وەزیرو کاربەدەستەکانی دەوروبەری خەلیفەی شەهید کردن جگە لە ئەلقەمی بەکرێ گیراو.

لێرەوە هۆلاکۆ فەرمانی دەرکرد بۆ سوپاکەی لەوەی کە ئازادن لە ئەنجامدانی هەر تاوانێك خۆیان پێیان خۆشەو، دواتر سەربازو چەتە دوور لەشارستانیەکانی تەتار بەربونە موسڵمانانی بەغداو لەماوەی چل ڕۆژدا زیاتر لەملیۆنێك موسڵمانیان شەهید کرد[١٣].

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین لەم هێرشەی تەتارەکاندا بۆ سەر شاری بەغداد کەس ڕزگاری نەبوو، جگە لەو خەڵکەی خۆیان لە ماڵ و ژێرزەمینەکاندا حەشار دابوو، ئەمانەش لە ترسی تەتارەکان بەهیچ شێوەیەك نەیان دەتوانی لە ماڵەکانیان بێنە دەرەوە، بێگومان ئەوەی لەم هێرشەی تەتارەکان ڕزگاری بوو تەنها کەمینە خیانەت کارە خاچ پەرەست و جولەکەکان بوون و لەگەڵ شوێن کەوتوانی ئەلقەمی بەکرێ گیراودا، هەموو ئەوانەش خۆیان دابوویە پاڵ ئەم شیعە ناپاکەوەو بەئازادی دەژیان، هەروەها هەندێك لە دەوڵەمەندو بازرگانەکانی بەغدا توانییان بە پارەیەکی زۆر

[١٣]– هەرچەندە جیاوازیەك هەیە سەبارەت بەژمارەی کوژراوەکان.

ئەمانێکی زەلیلانە هەڵبژێرن، پاشان تەتارەکان دەستیاندایە تـالآنی و دزی کردن لە زێڕو زیو و پارەو شتی بەنرخ، ئیدی تەنها خـوای گـەورە دەزانێـت سوپای تەتار چی بەئافرەتە موسڵمانەکان کرد، لەهەر شوێنێك ئافرەتێکیـان دیتبا دەست بەجێ وەك گـورگی برسـی پـەلاماریان دەداو زینایـان لەگـەڵ دەکرد، تا وەهای لێ هات خـەڵکی لـە ترسـدا دەرگایـان دادەخـست و لـە ماڵەکانیاندا نەدەهاتنە دەرەوە، بـەلآم تـەتارەکان دەرگاکانیـان دەشـکاندو بەزۆر دەچونە ژورەوەو پیاوەکانیـان دەکوشـتن و زیناشـیان لەگـەڵ ئافرەتـە موسـڵمانەکان دەکـرد، ئەگـەر دەرگاکانیـان بـۆ نەشـکابایە خانوەکـەیان بەخەڵکەکەوە دەسوتاند!.

وەك ئیبن کەسیر دەڵێت: کار گەیشتە ئەوەی خـەڵکێکی زۆر لـەناو بـیرو ژێر زەمین و شوێنە پیس وکون و قوژبنەکاندا بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ خۆیـان حەشار دەداو تیایاندا دەمانەوە، بەلآم هەر دەستی دڕندانـەی تـەتارەکانیان پێ دەگەیشت و دەیانکوشتن، ئەوەیشی لەو هێرشەی تەتارەکان ڕزگاری بـوو بە برسیەتی و نەهێنی و ترسەوە لە شارێکی وێرانکراودا ژیانیان دەگوزەراند.

دڕندەیی تەتارەکان مزگەوتەکانی کردە قەسابخانە، تەنانـەت بـۆ مـاوەی چەندین مانگ مزگەوتەکان داخران و، خەڵکی بەغدا نەیاندەتوانی ڕوویکەنە مزگەوتەکان بۆ ئەنجامـدانی نوێـژی بەکۆمـەڵ بەنوێـژی هەینیـشەوە؟ بـەم شێوازە ئەوەندە خەڵکیان شەهید کـرد وەك مێـژوو نوسـەکان دەڵـێن لـەناو کوچەو کۆلآنەکانی شاری بەغدا خوێن جۆگەلەی بەست، پاش ئـەوە ڕوویـان

کردە کتێبخانەی شارەکەو هەرچی کتێب و فەرهەنگی ماوەی پێنج سەدەی هەوڵ و ماندوبونی زانایان و بیرمەندانی ئیسلام بوو لە ملیۆنەها کتێب و دەسنوسی گرنگ، هەمویان فڕێدانە ناو ڕوباری دیجلەوە، بەڕادەیەك مێژوو نوسان دەڵێن ئاوی دیجلە ڕەنگی مەرەکەبی کتێبەکانی گرت، تەنانەت ئەو کتێبانە ئەوەندە زۆر بوون دەگێڕنەوە سەربازەکان بەرگی کتێبەکانیان وەك پرد لێکردبون و بەسەریاندا لە دیجلە دەپەڕینەوە.

دواترو پاش ئەم هەموو نەهامەتیانە، هۆلاکۆ بڕیاری کوشتنی بۆ خەلیفەی عەباسییەکان دەرکرد؟ بەپێی بەڵگە مێژوییەکان بڕیاری کوشتنی خەلیفە لەسەر پێشنیاری ئیبن ئەلقەمی و نەسیری توسی بووە، هەندێك دەڵێن ئەویشی سەربەرەوخوار لە جێگەیەکدا هەڵواسی و بەشەق دەیانکێشا بە سەریدا هەتا گیانی دەرچوو، هەندێکیش شێوازی کوشتنی خەلیفە دەگێڕنەوەو دەڵێن: خەلیفە خرایە ناو جەوالێك و بەشەق تێی بەربوون هەتا گیانی دەرچوو، هۆکاری کوشتنیشی بەم شێوازە بۆ ئەوە بوو تا دڵۆپێکیش لەخوێنەکەی نەڕژێتە سەر زەوی!؟ بەم شێوازەو بە هاوکاری کەمینە خاچ پەرەستەکان پایتەختی خیلافەتی عەباسی داگیرکرا.

هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر ئوممەت و خاکی ئیسلام درێژەی کێشا تا سەرئەنجام خیلافەتی عەباسییان ڕوخاندو ئەرشیف و بەری ڕەنجی زیاد لەپێنج سەدەی موسڵمانانیان لەناو برد، لەماوەی چل ڕۆژدا زیاتر لە یەك ملیۆن موسڵمانی بێتاوانیان شەهید کرد، پاش کۆتایی هاتنی شەپۆلی

کوشتنی موسڵمانانی بەغدا لەلایەن تەتارەکانەوە، ئـەو خەڵکانـەی تـاك و تەرا لەژیاندا مابون و لـەناو ژێـر زەمـین و کـون و قـوژبن و ئاوەڕۆکانـەوە بەترس و لەرزەوە هاتنەدەرەوە؟!

ئەوخەڵکەی خۆی حەشار دابوو وەك مردویان لێ هاتبوو تەنانـەت بـاوك کوڕی نەدەناسیەوە..ئیدی ئـەمانیش دوچـاری جۆرەهـا پـەتاو برسـیەتی و تاعون بوون، بلاوبونەوەی پەتاش دەگەڕایەوە بـۆ بـۆنکردنی جەسـتەی ئـەو هـەموو کوژراوانـەی لـەناو کوچـەو کۆڵانـەکانی بەغـداد وەك خـەرمان هەڵدرابونەوە..سـەرەنجام ئەوانـەی لـەم هێرشـەدا ڕزگاریـان بـوو بـە پـەتا جۆراوجۆرەکـان مـردن؟ ئـەم ڕووداوانـەش لـە سـاڵی "٦٥٦" ی کۆچـیدا ڕوویاندا.

## کەمینەکان و ڕۆڵیـان لە هاوکاری کردنی مەغۆڵەکاندا بۆ داگیرکردنی دیمەشق

پاش داگیرکردنی بەغدا، تەتارەکان خۆیان کـۆ کـردەوە بـۆ داگیرکردنـی ناوچەکانی وولاّتی شام، بۆ ئەو مەبەسـتەو سـەرەتا نەخـشەی داگیرکردنـی ناوچەکانی (میافارگین) یان دانا، (میافارگین) شـارێکەو ئێـستا دەکەوێتـە باکوری کوردستانەوە لە ڕۆژهەلاّتی تورکیا، لەو سـەردەمەدا میرنـشینێکی ئەیوبی بەهێز دەسەلاّتی بەسەر ئەو ناوچەیەدا هەبووەو سەرکردەکەیان ناوی شا (کامل محمد شهاب غازی) ئەیوبیـە، نـاوبراو دەسـەلاّتی بەسـەر چـەند ناوچـەیەکی بـاکوری کوردسـتان و بـاکوری ڕۆژئـاوای عێـراق و بـاکوری ڕۆژهەلاّتی سوریاو ناوچەکانی جەزیرەو چەندین ناوچەی دیکەدا هەبووە.

هۆلاکۆ بەمەبەسـتی داگیرکردنـی ناوچـەکە، سـوپایەکی لـە تـەتارەکان ئامادەکردو بەسەرکردایەتی (ئەشتەموت) ی کوڕی ناردیە سەر شـا (کامـل محمد) و داوای خۆبەدەستەوەدانی لێکـردو مـەرجی ئەوەیـشی لەسـەر دانـا پێویستە سەرەتا هەموو قەلاّکانی دەوری شار بڕوخێنێت، بـەلاّم ئـەم مـیرە خواناسە بە پێچەوانەی فەرمانڕەواکانی ترەوە بەتوندی داواکەی تـەتارەکانی بەرپەرچ دایەوەو بڕیاری جیهادو ڕووبەڕووبونەوەیدا.

هۆلاکـۆ مەبەسـتی بـوو شـام داگـیر بکـات، تـەنها ڕێگـا چـارەش بـۆ داگیرکردنی ناوچەکانی شام تێپەڕبوونی بوو بەناوچەکانی جـەزیرەدا کـە لـە ئێستادا قەلّەم ڕەوی ئەو سەرکردە موجاهیدو لەخواترسەیە، بەدڵنیاییەوە بۆ

سوپاکەی هۆلاکۆش گرتنی شاری (میافارگین) کارێکی یەکجار ئەستەم بوو بەتایبەتی ئەو شارە دەکەوتە ناوچەیەکی زۆر سەختەوە لەنێوەندی زنجیرە چیاکانی دەریای ڕەشدا، دواجار سوپای تەتار بەناچاری ڕێگە چارەی سەربازییان هەڵبژارد بۆ داگیرکردنی شاری (میافارگین).

شا کامل محمد هەوڵی زۆریدا دەسەلاتدارە موسڵمانەکانی ناوچەکە پشتیوانی بکەن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هێرشی تەتارەکان بەلام هەوڵەکانی بێسود بوون؟ چونکە ئەوان هەموویان بەئاواتی ئەوەبوون پلەوپایەکەی خۆیان لەدەست نەدەن تەنانەت ئەگەر بەزیللەتیشەوە بێت، هەر ئەوەیان بەلاوە باشتر بوو تا ڕێگای جیهادو شەهید بون و سەرفرازی هەتا هەتایی بەدەست بهێنن.

لاتان سەیرنەبێت لەو ساتەدا ئەم پیاوە موجاهیدە بڕیاری جیهادو ڕووبەڕووبونەوەی هەڵبژارد، دەسەلاتدارەکان دەچونە لای هۆلاکۆو پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانیان لێ دەکردو، لەلایدا کەیف و دڵخۆشی خۆیان دەردەبڕی بەرامبەر کوشتنی موسڵمانان و ڕماندنی خیلافەتی عەباسی، ئایا جیهاد بەم کەسە دونیا ویست و دور لە قیامەتانە دەکرێت؟! ئەوە سوڵتان (عزالدین)ـە هەستا بەدروستکردنی جوتێ پێلاوی تایبەتی شاهانەو وێنەی خۆی لەناو پێلاوەکاندا نەخشاندو بەدیاری ناردنی بۆ هۆلاکۆ!! هەتا لەپێیان بکات و قاچی بکەوێتە سەر وێنەکەی ئەم!؟.

لەبەرئەوە شا (کامل محمد) بەپشتیوانی خوای گەورە بڕیاری جیهادو

بەرگری هەڵبژارد بەسەر ژیانێکی زەلیلانەدا کە ژێر دەستەی تەتارەکان بێت، بۆ ئەو مەبەستە لەسەرەتادا بەتوندی وەڵامی کوڕەکەی هۆلاکۆی دایەوە کە داوای خۆ بەدەستەوەدانی لێ کردبوو و تیایدا هاتووە:

باشتر وایە میر ئاسنی سارد نەکوتێت و چاوەڕوانی ئەستەم نەکات، خۆ هیچ کات بڕوا بە بەڵێنەکانتان ناکرێت و هیچ کات لەسوپای تەتاریش ناترسم، هەتا زیندوبم بەشمشێر شەڕتان دەکەم، ناکرێت بڕوا بەکوڕی پیاوێك بکرێت کە بەردەوام پیشەی بەڵێن شکاندن بووە لەگەڵ خەلیفەو..

دواتر شا (کامل محمد) لەبەردەم گەلەکەیدا ووتارێکی بەپێزی ئاڕاستە کردن و ئامۆژگاری و داوای جیهادو بەرگریکردنی لێ کردن و، پاشان هەموو خەزێنەکانی دەوڵەتەکەی لەبەردەم خەڵکیدا والآکردو هەرچی پارەو زێرو زیو هەبوو هەمووی بەخشییەوە بەسەر دانیشتواندا، ئەوەشی ڕاگەیاندو گوتی: هیچ کات وەك خەلیفەی عەباسییەکان باوەش ناکەم بە دونیادا کە ئەوەندە درهەم و دیناری خۆش دەویست تا لەو پێناوەدا خۆیشی تیاچوو، هەموویان بەیەکەوە بڕیاری جیهادی تەتارەکانیانداو دواتر هێرشیان کردە سەر تەتارەکان و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ کوشتن، شا(کامل محمد) خۆیشی بەکردار بەشداری جیهادی تەتارەکانی دەکردو ماوەی ساڵێکی تەواو بەرگرییان کردو بەهیچ شێوازێکیش تەتارەکان توانای پێشڕەوییان نەبوو.

لە ناچاریدا تەتارەکان بڕیاری گەمارۆدانی شارەکەیانداو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆراك و پێداویستی موجاهیدان کەم دەبویەوە، کار گەیشتە سەر ئەوەی لە

برساندا دەستیان کرد بەخواردنی سەگ و پشیلەو ئاژەڵی مردارەوە بوو، تەنانەت مێژوونوسان باس لەوە دەکەن لە برساندا تەرمی مردووەکانیشیان دەخوارد..

سەرئەنجام کارەساتێکی زۆر گەورە ڕووبەڕووی شارەکە بوویەوەو بەئەندازەیەك کوچەو کوڵانەکان پڕبوون لە مردوو، بەو شێوازە دەرگاکانی شار بۆ تەتارەکان کرایەوە، کاتێك سوپا چونە ژورەوە دیتیان تەنها حەفتا کەس لەشارەکەدا بەنیمچە زیندویی ماونەتەوەو ئەوانیش خەریك بوو دەمردن؟!

شا (کامل محمد) یش لەنێوان ئەو حەفتا کەسەدابوو، ئەویان دەستگیرکردو ناردیان بۆ لای هۆلاکۆ، سەرئەنجام بڕیاری کوشتنیدا؟! بەڵام چۆن کوشتنێك؟ فەرمانی دەرکرد گۆشتی جەستەی بەزیندوویی لێ بکەنەوەو بەزۆر دەرخواردی بدەن! بەو شێوازە ئەوەندە گۆشتیان پێدا هەتا شا (کامل محمد)یش بە پلەی بەرزی شەهادەت گەیشت! سەرەکەشیان کرد بەڕمەوەو بەشارە گەورەکاندا دەیان گەڕاندو دواتر کەللە سەرەکەیان گەیاندە دیمەشق و بەدەروازەی (فەرادیس) دا هەڵیان واسی.

کوڕەکەی هۆلاکۆ لەسەر فەرمانی باوکی بۆ داگیرکردنی (ماردین) بەڕێکەوت، سەرکردەی شاری (ماردین) ناوی شا سەعید بوو، سوپای تەتار نامەی خۆ بەدەستەوەدانی بۆ نارد، ناوبراو داواکەی بەرپەرچ دایەوەو بڕیاری بەرگری کردنیدا، دواتر دانیشتوانی (ماردین) ماوەی هەشت مانگ

ڕووبەڕووی گەورەترین ئابلۆقەی ئـابوری بونـەوە، لـەم مـاوەدا دانیـشتوانی شارەکە هێندە ئازایەتییان نیشاندا، بەتـەواوەتی تـەتارەکانیان تـوڕە کـردو لەگەڵ درێژبونەوەی ئابلۆقەکـەدا خـۆراك و پێداویـستی لـە قەڵاکـەدا کـەم بویەوەو بەهۆیەوە خەڵکێکی زۆر مردن و پـەتاش لـەناو دانیـشتواندا بـڵاو بویەوە.

لەم کاتەدا موزەفەرەدینی کوڕە گەورەی شا سەعید، داوای لە باوکی کرد لەپێناو نـەمردنی خەڵکەکـەدا قەڵاکـە بەدەسـتەوە بـدات، بـەڵام نـاوبراو داواکەی بەرپەرچ دایەوەو دواتر موزەفەرەدین باوکی خـۆی ژەهـراوی کـردو قەڵاکەی دا بەدەستەوە.؟!

ئەم جۆرە هێرشانەی تەتارو داگیرکردنی ناوچەکان ماوەی ساڵێکی تەواوی خایاند، ئەوەبوو سوپای تەتارەکان لە موحەڕەمی ساڵی "٦٥٨" ی کۆچیدا گەیشتە حەلەب، لە هەموو لایەکەوە بـۆ مـاوەی هەفتەیـەك گەمارۆیـەکی تونـدیان خـستە سـەر شـارەکە، بـەڵام دانیـشتوانی حەلـەب ئامـادەی خۆبەدەستەوەدان نەبوون، توران شای جێگری یوسفی ئەیوبی کـە مامیـشی بوو، بڕیاری ڕووبەڕووبونەوەی سوپای تەتارەکانیـدا، لەبەرامبـەردا هۆلاکـۆ سەرکردە سەربازییەکانی بەسەر دەروازەکانی شاردا دابەش کـرد، دواتـر لـە چـواردەوری شـاردا مەنجـەنیقێکی زۆریـان جێگیرکـردو دەسـتیان کـرد بـە بۆردومانکردنی شارەکە.

بەو شێوازە جەنگێکی یـەك هەفتـەیی زۆر گـەورە لـەنێوان هـەردوولادا

ڕوویداو پەنجا هەزار کەس لە سەربازانی حەلەب بەپلەی بەرزی شەهیدی گەیشتن! تەتارەکان لەمانگی زیل حیجەدا توانییان شوراکانی شاری حەلەب ببەزێنن و سەرئەنجام شارەکە داگیرکراو وەك پیشەی هەمیشەیی خۆیان گەورەترین قەسابخانەشیان بۆ خەڵکی حەلەب بەرپا کردو کەوتنە ڕووخاندنی شوراکانی شارو بەهۆی مەنجەنیقەکانەوە دیوارو شورای قەڵاکانیان ڕوخاند.

بەو شێوازە وەك ئیبن کەسیر دەڵێت: حەلەب وەك کەرێکی ڕووتەڵەی لێهات؟! بێگومان لەو سەردەمانەدا لە هەموو شارێکدا قەلا هەبووە لە کاتی دروست بوونی مەترسیدا دانیشتوانەکەی خۆیان تیایدا حەشار دەدا، پاش داگیرکردنی شاری حەلەب، قەلاکەی بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەرگری کرد، سەرئەنجام قەلاکەش داگیرکراو لەبەرئەوەی دانیشتوانەکەی بەئازایانە بەرگرییان کردبوو، هۆلاکۆی خوێن مژ بەشێوەیەکی دڕندانە سەرجەم ئەو کەسانەی سەربڕی کە لە قەلاکەدا دەستگیریان کردبوون، بەبێ ئەوەی جیاوازی بکات لە نێوان پیاو ئافرەت و پیرو منداڵدا؟!

پاشان هۆلاکۆ گەمارۆی قەڵای (حارم)یدا، دانیشتوانەکەی داوای ئەمانیان لە هۆلاکۆ کردە مەرجی خۆ بەدەستەوەدان، ئەم خوێن مژە بێ ڕەوشتە وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی سەرەتا بەڵێنی ئەمانی پێدان و، بەلام دواتر فەرمانی کوشتنی بەکۆمەڵی بۆ هەموویان دەرکرد، تەنانەت ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتەکانیش ڕزگاریان نەبوو.

## بەرەو داگیرکردنی دیمەشق

دوای گەیشتنی سوپای هۆلاکۆ بەشاری حەلەب و داگیرکردنی، سوپایەکی بە سەرکردایەتی (کەتبگاوین)ی گەورە بەرپرسی دەوڵەتەکەی ئامادەکرد، بەمەبەستی داگیرکردنی شاری دیمەشق، سوپا جوڵەی پێکراو لە کۆتاییەکانی مانگی سەفەردا زۆر بەئاسانی توانی شاری دیمەشق داگیر بکات، دانیشتوانەکەی نەك هەر بەرگرییان نەکرد، بەڵکو گەورە پیاوانان و ناودارانی شارەکەو لەنێویشیاندا کەمینە مەسیحییەکانی شاری دیمەشق بەخۆشحاڵییەوە بەخێرهاتنی سوپای تەتارەکانیان دەکرد، پاشان هۆلاکۆ بڕیاری ئەمانیدا بەدانیشتوانی شارەکەو جارچی بەکوچەو کوڵانی شاردا دەگەڕاو ئەمانەکەی دەخوێندەوە.

تا ئەم ساتە هێشتا قەڵای شارەکە خۆی نەدابوو بەدەستەوە، تەتارەکانیش مەنجەنیقی زۆر پێشکەوتویان پێ بوو، بۆ ئەو مەبەستە لە ڕۆژئاواوە مەنجەنیقێکیان لەسەر قەڵاکە دابەست، بەهۆی ئەو مەنجەنیقەوە بەردی گەورەیان بە ئاراستەی قەڵاکە دەتەقاندو سەرئەنجام بەو هۆیەوە زۆربەی دیوارە بەردینەکانی قەڵاکەیان ڕوخاند، بەشێوازێك بۆردومانی مەنجەنیقەکە چڕ کرایەوە زۆری نەمابوو قەڵاکە بڕوخێت و پاشان کاربەدەستی قەڵاکە بەمەبەستی ڕێکەوتن هات بۆ لای تەتارەکان و دواجار قەڵاکەیان داگیر کردو کاربەدەستەکەشیان کوشت.

بەم شێوەیە تەتارەکان لە کۆتاییەکانی مانگی سەفەری ساڵی"٦٥٨" ی

کۆچیدا شاری دیمەشقیشیان داگیر کرد، دواتر داردەستێکی خۆیان کردە والی دیمەشق ناوی (ایل سیان) بوو، ناوبراو یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆر ڕێزی لە ئاینی مەسیحی دەگرت و تا ئەو ئەندازەیەی پلەوپایەی مەسیحیەکانیشی بەرز کردەوە.

لە ماوەی ڕابردوودا بەبەڵگەوە کاریگەری خاچ پەرستەکانمان بەسەر مەغوڵەکانەوە باس کرد، بەئاشکراو هەر لە سەرەتاوە دیار بوو مەغوڵەکان چەکێکن بە دەستی خاچ پەرستانەوە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و ڕوخاندنی خیلافەتی ئیسلامی.

بەڵێ گەورە بەرپرسانی ئاینی خاچ پەرستی لەدەوری "إیل سیان" ی سەرسەخت کۆبوونەوە، ئەم ناپاکە بەردەوام سەردانی کەنیسەکانیانی دەکرد، ئەم خاچ پەرستە داردەستەی تەتارەکان پۆستە نوێیەکەی بەهەلزانی بۆ بەرزکردنەوەی کەمینە خاچ پەرستەکان و بەکارهێنانیان بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانان.

لەپاش کۆبوونەوەی"إیل سیان" لەگەڵ گەورەکانی ئاینی مەسیحیدا، دواتر ناوبراو کلێساکانی بەسەرکردەوەو بەڵێنی پێدان دەوڵەتێکیان بۆ دابمەزرێنێت، بەم بۆنەوە وەفدێکی مەسیحییەکان سەردانی هۆلاکۆیان کردو کۆمەڵە دیارییەکی بەنرخیان پێشکەشی هۆلاکۆ کرد.

ئەم هەموو ماستاوەی مەسیحییەکان بۆ هۆلاکۆیەکی دڕندە کە خاوەنی هیچ جۆرە ڕەوشت و بەهایەك نیە، تەنها لەبەرئەوەبوو ئەمانێکی زەلیلانەی

لێ وەربگرن.

شایانی باسە مەسیحییەکان لە دەرگای "تومائەوە" ڕۆیشتنە ژوورەوەو هەموویان بە دروشمی (ئاینی ڕاست دەرکەوت کە ئاینی مەسیحییە) خاچیان بەرز کردبووەوەو، ئەم دروشمەیان بە دەنگی بەرز دووبارە دەکردەوەو سەرزەنشتی ئاینی ئیسلام و شوێنکەوتوانیان دەکردو هاوکات دۆڵچەی پڕ لە شەراب "خەمر" یان بە دەستەوە بوو لە کاتێکدا بەلای دەرگای مزگەوتەکاندا تێپەڕ دەبوون دەیان پرژاند بە مزگەوتەکانداو پیسیان دەکردن، هەروەها شەرابیان دەکرد بەسەر دەم و چاو و جل و بەرگی موسڵماناندا، لەناو بازاڕو دوکانەکانیشدا هەر بەو شێوە ناشرینە خەڵکیان ئازار دەدا، وتار بێژەکەیان دوکان بە دوکان دەگەڕاو باسی شتە چاکەکانی ئاینی مەسیحی دەکردو درۆو بوختانی لەدژی ئیسلام و موسڵمانان بلاو دەکردەوە.

پاشان چونە کلێسای مەریەمەوە، ئەو سەردەمە کەنیسەکە ئاوەدان بوو، زۆر بەتوندی لە خەڵکیان ئەداو شانازیشیان بەو ڕەفتارانەیانەوە دەکرد، ئەم ڕەفتارانەی ئەمان بوو بەهۆی وێران بوونی کەنیسەکە، بەڵێ ئەوان نیازیان وەهابوو درێژە بەم حاڵەت و سیاسەتەی مەغۆڵەکان بدەن لە ترساندنی موسڵمانان و ڕوخاندنی مزگەوت و قوتابخانەو سەرجەم شوێنەوارەکانی تری ئیسلام.

تەنانەت مەسیحییەکان بەتەمابوون ئەم داگیرکارییەی تەتارەکان درێژە بکێشێت هەتا بتوانن هەموو مزگەوتەکانی وولات بڕوخێنن؟!.

لە کاتێکدا موسڵمانان ڕەخنەیان لەم سیاسەتەی مەغۆڵەکان گرت و بۆ ئەو مەبەستە، شەرع ناس و پیاوماقولآنی موسڵمانان سەردانی (ایل سیان) یان کرد بۆ گەیاندنی سکاڵاو ناڕەزایی خۆیان لەو حاڵەتەو دڕندایەتی مەسیحییەکان، بەڵام ناوبراو دەستی کرد بەسوکایەتی کردن بە وەفدەکەی موسڵمانان و سەرئەنجام دەری کردن و هیچ گوێی بۆ داخوازییەکانیان نەگرت و ڕەوایی دایە کردەوە نەشیاوەکانی مەسیحییەکان.

بەڵێ ئەمە بەشێکە لە هەڵوێست و ڕەفتاری کەمینەکان لە بەرامبەر دەوڵەتی ئیسلامیدا، بەدرێژایی مێژوو ئەگەر بچوکترین دەرفەتیان بۆ ڕەخسابێت هیچ سڵیان لە دەست تێکەڵکردن لەگەڵ ناحەزانی ئیسلام نەکردوەتەوە، لەپێناو لێدانی موسڵمانان و داگیر کردنی وڵاتی ئیسلامیدا.!!

وەك ئاماژەمان پێکرد ئەم خاچ پەرستانە کەمینەیەك بوون لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا، سەردەمانێکی زۆر موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی پارێزەری مافەکانیان بوون، بەداخەوە لە بەرامبەر هەموو ئەو خزمەتانەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەچوون دەستیان لەگەڵ ناحەزانی ئیسلام دا تێکەڵ دەکرد، بەمەبەستی ڕوخاندنی دەوڵەت و مێژوو و ژیاری موسڵمانان، هاوکاری دوژمنان بوون لە داڕشتنی نەخشەو پیلانی دوژەخیدا: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ۝٦٠ ﴾[14].

---

[14]– الرحمن:٦٠.

## کەمینەکان و ڕۆڵیان لە هاوکاری کردنی فەڕەنسیەکان و هێرشکردنە سەر میسرو داگیرکردنی

وڵاتی میسر وەك سەرجەم ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی لەژێر سایەو سێبەری خیلافەتی عوسمانیدا بووە، هاولاتییەکانی لە بەختەوەریدا ژیاون؟ چونکە بەکردار پەیامەکەی پەروەردگار خۆش گوزەرانی بۆ فەراهەم کردبوون و لە هەموو کاروبارێکیشیاندا تەنها سەرچاوەی بڕیاردانیان ئاینی ئیسلام بوو.

لەناو میسریشدا کەمینەکان هەمیشە سەرباری ئەو هەموو خزمەتەی دەوڵەتی ئیسلامی بۆیان، بەبەردەوامی بیریان لەوە کردووەتەوە چۆن بوارێك بۆ خۆیان بڕەخسێنن تا خەنجەری خیانەت و بێوەفایی لە دەوڵەتی ئیسلامی بدەن، هەر لەبەرئەوە بەردەوام کەمینەکانی میسر هەوڵیان داوە خۆیان لە دەوڵەتی ئیسلامی و کۆمەڵگای میسری جیا بکەنەوەو، بەردەوام هەستی جیاخوازییان بۆ خۆیان پەرە پێداوەو کاریان لەسەر ئەوە کردووە وەچەکانی پاش خۆشیان لەسەر ئەوە ڕابهێنن کە ئەمان بەشێك نین لە کۆمەڵگای میسریی و کیان و بوونی خۆیان دەوێت.

کەمینەکانی میسریش بەردەوام لەدوی بوارێك گەڕاون تا بتوانن لە پشتەوە خەنجەری غەدرو بێوەفایی لە دەوڵەتی ئیسلامی بوەشێنن، ئەو دەوڵەتەی چەندین سەدە کەمینەکان لە سایەیدا بەئازادی و سەربەستی تەواوەوە ژیانیان بەسەر بردوە، لە دیارترینی ئەو خیانەتانەی کەمینەکان لە

میسردا ئەنجامیانـدا هاوکـاری و کارئاسـانی کردنـی ئـەوان بـوو بـۆ فەڕەنسیەکان لە کاتی داگیرکردنی میسردا لە ساڵی "١٢١٣" ی کۆچیدا.

هۆکاری داگیرکردنی میسر دەگەڕایەوە بۆ کۆمەڵێك پاڵنـەری ئـابوری و سیاسی و بازرگـانی کـە ڕاسـتەوخۆ ئـەم هێرشـەی سـەر میـسر خزمـەتی بەرژەوەندی خاچ پەرستانی دەکردو، فەڕەنسییەکان لـە کـاتی ئـەنجام دانـی هێرشەکەدا هەستیان بەوە دەکرد گەلی موسـڵمانی میـسر زۆر خۆڕاگرانـەو بەتونـدی دژی ئـەم هێرشـە دەوەسـتێتەوەو ئۆپۆزسـیۆنی خۆیـان لـە دژی هێرشەکە ڕادەگەیەنن.

لەبەر ئەوە فەڕەنسیەکان بیریان لە چارەسەر "بـدیل" ێـك دەکـردەوە تـا بەهۆیەوە بتوانن لە ئاستی ناڕەزایەتی و تووڕەیی و نیگەرانی گەلی میسری کەم بکەنەوە، بۆ ئەمەش ڕاستەوخۆ پەنایان بۆ کەمینەکانی میسر بـرد تـا هاوکاریان بن لە گونجاندنی بارووددۆخەکـە بەئاراسـتەی ڕێگـە خۆشـکردن و کارئاسانی کردن بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندییەکانیان لە میسردا.

بەدڵنیاییەوە فەڕەنسیەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە بـەکارهێنانی کەمینەکان بۆ گەیشتن بەئامانج و بەرژەوەندیەکانیان، ئەوەبوو دەست بەجێ لە ڕێگەی کەمینە مەسیحییەکانی ناو میسرەوە کەوتنە جێ بەجێ کردنـی پیلانەکانیان، سەرەتاش وەکو سەرباز لە ڕیزەکانی سوپادا وەریانگرتن؟! ئەو کەمینانەی سەردەمانێکی زۆر بەهێمنایـەتی لـە خـاکی میـسردا ژیانیـان بەسەر بردووە! ئەمڕۆ ڕاستەوخۆ خۆیان کردە داردەستی دوژمنانی ئیسلام.

بۆ ئەو مەبەستە سوپای فەڕەنسی پاش داگیرکردنی میسرو بەمەبەستی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە، پەنای بۆ کەمینە خاچ پەرەستەکان بردو داوای لە (جرجس جوهری) سەرۆکی هەموو قیبتییەکانی میسر کرد، چەند قیبتییەکی پسپۆڕی ئیداری بۆ دیاری بکات، تا سوپای فەڕەنسی بیانکاتە سەرپەرشتیاری ناوچەکان بەمەبەستی گەڕاندنەوەی ژیان بۆ قۆناغی پێش هێرشەکە، ئەوەبوو (جرجس جوهری) ناوی پێنج کەسی ئیداری لەقیبتییەکان دا بەناپلیۆن و ئەویش کردنی بە بەرپرسی ناوچە جیاوازەکانی میسر، یەعقوب حەنناش یەکێك بوو لەو کەسانەو هەمانکات ناوبراو کرا بە بەرپرسی گشتی ئازوقەو خۆراك و تفاقی سوپای فەڕەنسی، بێگومان ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو، لەسەری پێویست بوو خواردنی ئەو "٣٠" هەزار سەربازە فەڕەنسیە دابین بکات کە بە ناوچە جیاوازەکانی میسردا بلاو بوو بوونەوە.

دیارترینی ئەو کەسانەی لەو کاتەدا بەرەمزی خیانەت و بێ وەفایی دەناسران (یەعقووب حەننا) بوو، ناوبراو لە پێشەوەی ئەو کەسانەدا بوو کە هەستان بەخیانەت کردن لە خودی ولاتەکەی خۆیان لە سەردەمی نوێ دا (عصر الحديث)، یەعقوب حەننا ئەو کەسەیە لەگەڵ باسکردنی هاوکاری کەمینەکانی میسر بۆ هێزە فەڕەنسییەکان دێتە ناو ناوانەوە، ئەو بەدڵسۆزترین قیبتی میسری دادەنرێت کە بۆ بەرژەوەندی فەڕەنسییەکان کاری کردبێت، ناوبراو بەردەوام خەریکی کۆکردنەوەی سەرانە بوو بۆ

هێزەکانی فەڕەنسا، هەمان کات وەك ڕاوێژکاری جەنەڕاڵ (دیزیە) لە سوپای فەڕەنسیدا دەست بەکاربوو لە جەنگەکەیاندا لە دژی موراد بەگ لە ناوچەی (صعید).

بە دڵنیاییەوە ژەنەراڵ (دیزیە) هەتا پرس و ڕاوێـژی بـەم بـەکرێ گـیراوە نـەکردبێت هـیچ کـارێکی ئـەنجام نـەداوەو، لـە شۆڕشـی عوسمانییەکانـدا بەسەرکردایەتی (ناصف پاشا) کە لە قاهیرە بـۆ دەرپەڕانـدنی داگیرکـەرانی فەڕەنـسا ئەنجامـدرا، هـەر یـەعقوب حـەننای بـەکرێ گـیراو ڕاسـپێردرا ڕووبەڕووی هێرشی عوسمانییەکان بوەستێتەوە.

پاش ئەوەی ناپلیۆن میـسری بـەجێ هێـشت، یـەعقوب حـەننای خـاچ پەرەسـت هەسـتا بەدروسـتکردنی کەتیبەیـەکی سـەربازی تایبـەت بـە مەسـیحییە میـسرییەکان و ڕاسـتەوخۆ لەلایـەن ئەفـسەرانی فەڕەنـساوە مەشقیان پێ دەکرا لەسەر شێوازی پێشکەوتووی ئەوروپا، بە هەموو جـۆرە چەکێکی سەربازی پێشکەوتوو هاوکارییان دەکردن، وە یەعقوب حـەننا بـە یەکێك لە دەویتەکانی ناپلیۆن دادەنراو دواتریش پۆستی فەرماندەی گـشتی هێزە قیبتییەکانی ناو سوپای فەڕەنـسی لەمیـسردا پـێ سـپێردرا، ئـەوەی جێگای تێڕامانی مێژوو نوسـانە، یـەعقوب حـەننای خـاچ پەرەسـت هـەر کارێکی پێ سپێردرابێت لەلایـەن داگیرکـەرانی فەڕەنـساوە بـە وردبینـی و لێهاتوییەکی زۆرەوە جێ بەجێی کردووە؟!

لەکاتی هێرشی ناپلیۆنـدا بـۆ سـەر میـسر هاوشـانی یـەعقوب حـەننا

چەندین کەسایەتی تری ناو خاچ پەرەستە کەمینەکانی میسر پەیوەندییان کرد بەسوپای ناپلیۆنەوەو لەوانەش (جرجس جوهری) کە پاش ئەوەی پەیوەندی خیانەتکارانەی لەگەڵ ناپلیۆندا بەست و دڵسۆزی خۆی بۆ دەربڕین کرایە وەزیری دارایی.

هەروەها (یوسف الملطي و الیاس بقطر) لە گرنگترینی کەسایەتی خاچ پەرەستە کەمینەکانی میسر بوون کە پەیوەندییان بەناپلیۆن و سوپای فەڕەنسیەوە کرد، (یوسف الملطي) کچە زای یەعقوب حەننا بوو، دوای ئەوەی لە فێربونی زمانی فەڕەنسیدا سەرکەوتنی بەدەستهێناو دواتر وەك سکرتێری تایبەتی ناپلیۆن دەست بەکاربوو، ماوەیەکیش وەك وەرگێڕی فەرمی سوپای فەڕەنسی کاری کرد، پاش ئەوەی فەڕەنسیەکان میسریان بەجێ هێشت ناوبراو پەیوەندی بەفەڕەنسیەکانەوە کردو وەك مامۆستا لە مەکتەبی فەڕەنسی لە پاریس کاری کرد.

یەکێکی تر لەو قبتییە میسریانەی لەکاتی هێرشەکەی ناپلیۆندا پلەیان بەرز کرایەوە (أنطوان أبو طاقیة) بوو، وەك نوێنەری حکومەتی داگیرکەری فەڕەنسی لە شاری (الشرقیە) دەست بەکاربوو، وە (فلتئوس حنا) ش یەکێکی تر بوو لە قیبتییەکانی میسرو پاش ئەوەی خۆی بە فەڕەنسییەکان فرۆشت، کرا بەنوێنەری حکومەتی داگیرکەرانی فەڕەنسا لەشاری (الغربیە).

ناپلیۆن بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە میسردا زۆر ڕێگای گرتونەتە بەر؟ چونکە دەیزانی گەلی میسری گەلێکی موسڵمانن و ئاسان ئەوە قبوڵ

ناکەن کە سوپایەکی خاچ پەرەست وولاتەکەیان داگیر بکات.

وەك مێژوونوسان دەڵێن: ناپلیۆن بۆ داگیرکردنی میسر لـە ڕێگایەکـەوە سوپاکەی بەرەو میسر جولاندوە، پێچەوانە بووە لەگەڵ ڕێگای هـەموو ئـەو فەرماندە سەربازییانەی خاچ پەرەستان کە لە ڕابردودا گرتویانەتـە بـەر بـۆ داگیرکردنی میسر، هاوکات لەگەڵ داگیرکردنی میسریشدا ناپلیۆن بەردەوام بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەوان موسڵمانن و خۆشەویستی خۆیان بۆ ئیـسلام و میسرییەکان دەردەبڕی؟! ناپلیۆن بەردەوام تەنها داواکـاری لـە سـوپاکەی ئەوە بوو چۆن لە ڕابردوودا ڕێزیان لە ئـاینی جولەکـەو مەسـیحی گرتـووە، بەهەمان نەفەسیشەوە ڕێز لەئاینی ئیسلام بگـرن؟ هـەتا بتـوانن کـۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکەن و ڕووبەڕووی خۆپیشاندان و شۆڕشی چـەکداری نەبنـەوە؟ بێگومان ئەمەش جۆرێکـە لـە داننـان بەئیـسلام و موسـڵماناندا لەلایـەن ڕۆژئاواییەکانەوە! لەپێش دابەزینی سوپاکەیدا بۆ وشکانی ناپلیۆن وتەیەکی پێشکەش کردن و ڕایگەیاند: ئەو گەلەی کـە ئێـوە پێـی دەگـەن گـەلێکی موسڵمانن، یەکەمین شتێکیش باوەڕیان پێیەتی (لا الە الا اللە - محمد رسول اللە) یە، بەهیچ شێوەیەك دژایەتی بیروباوەڕیان مەکەن، لـە ڕابـردودا چـۆن هەڵـسوکەوتتان لەگـەڵ جولەکـەو ئیتاڵیەکانـدا کـردوە، بەهـەمان شـێوە هەڵسوکەوت لەگـەڵ موسـڵماناندا بکـەن، ڕێـزی زانایـانی ئیـسلام بگـرن هاوشێوەی ڕێزگرتنتان لەپیاوانی ئاینی جولەکەو مەسیحی! چۆن ڕێزتان لـە دروشم و شوێنی پەرستنی مەسیحی و جولەکە گرتووە، لە ئێستاشدا ڕێز لە

مزگەوت و سەرجەم دروشمەکانی موسڵمانان بگرن!.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە؟ ئایا سەربازەکان چۆن ئەم ئامۆژگارییانەی ناپلیۆن جێبەجێ بکەن، لە کاتێکدا ئەوان هیچ شتێك لە بارەی ئیسلامەوە نازانن و بەمەبەستی لەناوبردنی موسڵمانانیش هاتونەتە وڵاتی میسرەوە؟

لەو بارەوە مێژوونوسان دەڵێن: شۆڕشی فەڕەنسی بووە هۆی دورخستنەوەی فەڕەنسییەکان لە ئاینی مەسیحی، لەبەرئەوە ناپلیۆن هەر ئەوەندەی مەبەست بوو سەربازەکانی ئەوە نیشانی موسڵمانان بدەن ئەوان رێز لە ئیسلام و پیرۆزیەکانیان دەگرن.

وە دامرکاندنەوەی شۆڕشەکانی گەلی میسری خرایە ئەستۆی ئەم کەمینە بەکرێ گیراوانە، (یەعقوب حەننا) لەلایەن فەڕەنسییەکانەوە پلەی (جەنەڕاڵ)ی پێ بەخشرا، هەروەك نازناوی فەرماندەی کەتیبە قیبتییەکانی سوپای فەڕەنسیشی پێ بەخشرا.

ئەمە سەرباری ئەوەی هێزەکانی سوپای فەڕەنسا بەئاشکرا هاوکاری دەکران لەلایەن میلیشیاکانی یەعقووب حەنناوە لە دامرکاندنەوەی شۆڕشی یەکەمی قاهیرەی ساڵی "١٢١٣" ی کۆچی و، شۆڕشی دووەمی قاهیرەی ساڵی ١٢١٤ی کۆچیدا، کە سەگێك بەناوی (کلێبەر) بە یەعقوب حەننای ڕاگەیاند چی پێ خۆش بێت لە دژی خەڵکی قاهیرە درێغی نەکات، ئەم ڕێ پێدانەش لەپاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی دووەمی قاهیرە هات، یەعقووب حەننای ناپاکیش هەستا بە نانەوەی پشێوی و نائارامی و تاڵانکردنی

سەروەت و سامانی وڵات و ڕوخاندنی مزگەوتەکان و بێ ئەدەبی کردن بەرامبەر پیرۆزییەکان و هتد.

بە کورتی (یەعقووب حەننا) تاوان گەلێکی ئەوتۆی لە میسردا ئەنجامدا کە پێنوس شەرم دەکات لە نووسینیان.

دەبێت ئاگاداری ئەوە بین یەعقووب حەننای قیبتی و کەتیبە سەربازییە قیبتییەکەی، سەرەتایەکە بۆ ئەو حاڵەتەی لە مێژووی میسردا بەناوی (فیتنەی تائیفی) ناسراوە، بەڵام مایەی سەرسوڕمانە لە پاش ئەوەی یەعقووب حەننا لەلایەن قەشەکانەوە بەڕێزەوە ناودەبراو لە میسردا ئاهەنگی بۆ ڕێك دەخرا، بە شانازیەوە دەیان وت یەعقوب حەننا جیهادی لە دژی موسڵمانان کردووە، لەوەش سەرسوڕمانتر هەڵوێستی مێژوونوسە مەسیحییە هاوچەرخەکانە کە بەردەوام بە ڕێزو سوپاسەوە کارەکانی یەعقووب حەننای خاچ پەرستی ناپاك هەڵدەسەنگێنن.

بەنموونە ئەوە وتەیەکی د.لویسە ناوبراو نوسەرێکی بەناوبانگی خاچ پەرستانەو بەوە ناسراوە زۆر دژایەتی موسڵمانان دەکات و سەبارەت بە یەعقووب حەننا دێتە گۆو دەڵێت: ئەو ڕۆڵ و کاریگەریەی لە مامۆستا یەعقوب حەنناوە پێشکەشی فەرەنسیەکان کرا لە دژی عوسمانیەکان، بە هاوکاری و دەست بارێکی ئەوەندە گەورە سەیر دەکرێت شایەنی ئەوەیە لە پاداشتیدا پەیکەرێکی لە زیو بۆ دروست بکرێت و، لە گەورەترین گۆڕەپانی قاهیرەدا دابنرێت و لێی بنووسرێت ئەمە یەکەمین کەسێکە داوای

سەربەخۆیی میسری کردووە لە چەرخی نوێدا..؟!!

سەبارەت بە دڵسۆزی یەعقوب حەننا بۆ فەرەنسیەکان، مێژوونوس (شفیق غربال) نامەیەکی جەنەڕاڵ (جاك مینو) دەخاتە ڕوو کە ئاڕاستەی ناپلیۆنی کردوەو تیایدا دەڵێت:

من پیاوێکی خاوەن زانیاری و ڕۆشنبیری بەرفراوانم لەلایە، ئەویش یەعقوب حەننایە، ناوبراو تا ئێستا توانیویەتی چەندین خزمەت پێشکەشی سوپای فەرەنسی بکات، لەوانە: بەهێزکردنی سوپای فەرەنسی، ئەویش بەهێنانی سەربازە قیبتییەکان بەمەبەستی هاوکاری کردنی هێزەکانمان لەناوچەکانی میسردا.

پێویستە ئەوە بخەینە ڕوو تا ئێستاش لە میسردا باس لە چۆنیەتی هاوکارییەکانی یەعقوب حەننا دەکرێت بۆ خاچ پەرستان لە کاتی داگیرکردنی ئەو وڵاتە لەلایەن فەرەنسیەکانەوە..

## کەمینەکان و ڕۆڵیان لە کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیدا

هەمووان لێرەدا کەمێك لـەو ڕۆڵـە ناپاکـەی کەمینـەکان تێگەیـشتن کـە بەدرێژایی مێژوو خستویانەتە گەڕ لە دژی دەوڵەتە ئیـسلامییە یـەك لـەدوای یەکەکان، ئەو دەوڵەتانەی کەمینەکان لەژێر سایەیاندا ژیـان و بـەهێز بـوون و گەشەیان کـرد، بـەڵێ بـە درێـژایی مێـژوو کەمینـەکان "جوولەکـە، گـاور" لەبەرامبەر پاراستنیان و چاکەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ ئەوان، بەپێچەوانەوە لە بری ئەوەی ئەو دەوڵەتە بە موڵکی خۆیان بزانن و بیپـارێزن، هەسـتاون لـە پشتەوە خەنجەری غەدرو بێ وەفاییان لێ داوە.!!

ئـەوە ئـەورووپای خـاچ پەرەسـتە بـەردەوام پێـداگرییان کـردووە لەسـەر هەڵگیرساندنی جەنگ لە دژی دەوڵـەتی عوسمـانی، لـەپێناو گەیـشتنیان بـەو ئامانجەش هەوڵیان دەدا لەناو جەرگـەی دەوڵـەتی عوسمانیـدا ئـاژاوەو فیتنـە بەناوی شۆڕشەوە بەرپا بکەن.! بەتایبەت کاریان لەسەر ئەوە دەکـرد لـە ڕێـی کەمینە ئاینییەکانی ناودەوڵەتی عوسمانییەوە ئـاژاوەی ئـاینی نـاو دەوڵـەت پەرە پێ بدەن و، لەو ڕوانگەوە کاریان دەکرد تا دەوڵەت لاواز بکـەن و پاشـان بە یەکجاری لە ناوی ببەن.

بەدڵنیاییەوە ئەورووپاو ڕۆژئاوا چـەکی سـەرەکییان بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەم ئامانجەیان بەکارهێنانی کەمینەکان بوو، هەتا پیلانەکانیان لە ڕێـی ئەوانـەوە لەناو جەرگەی دەوڵەتی ئیسلامی دا جێبەجێ بکەن، بێ گومان کەمینـەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی زیاتر لـە جوولەکـەو گـاور پێـك هـاتبوون، ئیـدی ئـەم

کەمینە ناپاکانە هەرگیز ئەوەیان لەبەرچاو نەبوو کە بە بەردەوامی لەلایەن سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە هاوکاری دەکران و بە هەموو شێوەیەك لە مەترسی ناوخۆو دەرەکی دەیانپاراستن.

تەنانەت لەپێناو بیرنەکردنەوەی کەمینەکان لەخیانەت، زۆر لە سوڵتانەکان ئافرەتیان لێ خواستبون، بەڵام کەمینەکان هەر بەردەوام بوون لە جێ بەجێ کردنی نەخشە دۆزەخییەکانی ناحەزانی ئیسلام و موسڵمانان لە پێناوی ڕووخاندنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەدا، لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی گەورەو سەرەکی جوولەکەکان بکەین لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت لە ڕۆڵی گاورەکان کەم بکەینەوە لە نانەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی و ترس لەناو ئەو دەوڵەتەدا، تەنانەت گاورەکان ڕۆڵی کاریگەریان بینی لە دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان پیاوانی ئاینی لەگەڵ سەرۆك و پادشاکانی ئەوروپاو بەتایبەتی ڕۆژئاواداو ڕووسیا، ئەمەش لە دەقی نامەیەکی بەڵگەنامەیی گرنگدا ڕووندەبێتەوە کە (جریجوریوس) بۆ قەیسەری ڕووسیای ناردوە.!

لەو نامەیەدا چۆنیەتی ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی ڕوونکراوەتەوە، شیاوی باسە لە نامەکەدا ئاماژە بە هەڵگیرساندنی ئاژاوەی ناوخۆیی کراوە، وەك خاڵی دەست پێکردنی ڕووخاندنی ئەو دەوڵەتە، لە نامەکەدا پیلانیش بۆ چۆنیەتی مراندنی ڕۆحی ئیمانی و مەعنەوی کراوە لەناو موسڵماناندا، هەروەك ئەو هۆکارانەش دیاریکراون کە یارمەتی دەرن بۆیەکگرتویی موسڵمانان و سەرکەوتنیان بەسەر دوژمناندا (عقیدة الولاوالبراء).

# خستنەڕوی ڕۆڵ و کاریگەری کەمینەکان بە گاورو جولەکەوە لە ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا

## یەکەم: ڕۆڵی گاورەکان لە کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیدا

دەوڵەتی عوسمانی بەردەوام پارێزەری مافی گاورەکان بووە، ئەمەش لەو ڕوانگەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەوان بەشێك بوون لەو دەوڵەتە ئیسلامیە، لەبەرئەوەش بووە کە لەناو دەوڵەتدا پلەوپایەو بەرپرسیاریەتییان پێ سپێردراوەو هەمانکات لە جەنگەکاندا بەشدارییان کردوەو بەهرەمەند بوون لەئاسایش و هێمنایەتی و خێروبێری دەوڵەتی عوسمانی، کەمینە گاورەکان لەسایەی ئەو دەوڵەتەدا ئەرك و مافیان هەبوەو زۆر بەخۆشگوزەرانی لە سێبەری دەوڵەتە مەدەنیەکەی موسڵماناندا ژیانیان بردووەتە سەر.

گاورەکان لەگەڵ ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانی دەستیان کرد بە زیاد کردنی نفوزو هێزی خۆیان و، بلاوکردنەوەی بیروبۆچوونە ڕۆژئاواییەکان، بەتایبەت لەسەرەتای سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەمەوە کە ناوبراو بواری بۆ گاورەکان کردەوە تا بە ئارەزووی خۆیان لەناو موسڵماناندا ژەهری خۆیان بڕێژن، ئەوەبوو سەرئەنجام گاورەکان کەوتنە کێبەرکێ کردن لەگەڵ ئەو کۆمەڵگا ئیسلامییەدا.

لەلایەکی دیکەوە ناوبراو دووەم هۆکاری سەرەکی بوو کە توانی بیرو باوەڕی "خۆش ویستن و ڕق لێ بوون" (عقیدة الولاء والبراء) لەناو کۆمەڵگای

ئیسلامیدا بسرێتەوە، سولتان مەحمودی دووەم لە یەکێك لە وتەکانی دا دەڵێت: من نامەوێ هەر موسڵمانان لەناو مزگەوت و گاورەکان لە کەنیسەو جوولەکەکان لە پەرستگادا ببینمەوە، بەپێچەوانەوە من دەمەوێ کۆمەڵگا بەبێ جیاوازی ئاین بەئاراستەی خۆش گوزەرانیدا ببەم، بەشێوەیەك هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بەبێ جیاوازی هەست بەوە بکەن مافەکانیان دابین کراوە.!!

لەبەرئەوە گاورەکان لەسەردەمی ئەودا ئازادییەکی لە ڕادەبەدەریان هەبوو، بەدڵنیاییەوە ئەمەش زیانێکی زۆر گەورەی لە دەوڵەتی عوسمانی دا، لەپاش ئەویش سولتان عبدالمجیدی دووەم هات و ناوبراو تەمەنی شانزە ساڵ بووەو زۆر کاریگەر بووە بە ڕۆژئاوا، هەروەك (مستەفا پاشا ڕەشید) لەو کەسانە بووە کەوتووەتە ژێرکاریگەری ڕۆژئاواو (خط شریف جلخانة) یان دەرکردوەو تیایدا ئاماژەی بەیەکسانی ئەرك و مافی (موسڵمان، بێ باوەڕ) ی کردووە.!!

لە پاش ئەوە خەتی هەمایۆنی هات بەدوایدا کە لە هەشت ساڵ پێك هاتبوو، پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد یەکسانی لە نێوان موسڵمانان و بێباوەڕاندا بکرێت لەڕووی هەموو ئەرك و مافێکەوە.

ئیدی ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی (عقیدة الولاء والبراء) بەتەواوی لەناو کۆمەڵگای ئیسلامی ئەو سەردەمەدا هەڵ بگیرێت، لەگەڵ ڕادەی ئەو هەموو ئازادی و سەربەستییە بێ سنورەدا کە بووە هۆکاری کوژاندنەوەو مراندنی بیروباوەڕی خۆش ویستن و ڕق لێ بوون (عقیدة الولاء والبراء)، ئیدی دەبێت پەرچە کردار چی بێت لە بەرامبەر ئەو هەموو تەنازولانە..؟! ئایا هەست بەوە دەکات ئەمە بەشێکە لەو نیشتمانەی جیاوازی ناکات لەنێوان ئەم و بێ

باوەڕێکدا..؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر.؟!

گاورەکان بەردەوام پاڵپشت و هاندەرو وروژێنەری ئاژاوەکان بوون و بەناوی شۆڕشەوە هەوڵی کۆکردنەوەی خەڵکیانداوە تا دژی دەوڵەتی ئیسلامی بێنە سەر شەقام، ئەمەش بەڕوونی لە ئاژاوە بەناوبانگەکەی یۆنان دا دەردەکەوێت کە لە ساڵی "١٨٢١" بەرپا کرا..!!

ئەگەر یەکێك بپرسێت ئەم ئاژاوە بەشۆڕش کراوە لە سەردەمی کێ دا بوو؟ بێگومان لە سەردەمی سوڵتان مەحموودی دووەم دا بوو، ناویراو دەرگای بەڕووی گاورەکاندا کردەوە تا بەئارەزوی خۆیان لەناو وڵاتی ئیسلام دا تەڕاتێن بکەن و نەخشەو پیلانەکانیان جێ بەجێ بکەن، لەم ئاژاوەیەدا گاورەکان لە وڵاتی خۆیانەوە بەرەو یۆنان کۆچیان کرد بۆ بەشداری کردن لەو ئاشوبەی دژی دەوڵەتی عوسمانی ئەنجام دەدرا.

گاورەکان لە هەموو شوێنێکەوە کۆچیان کرد بەرەو یۆنان لەپێناو دژایەتی کردنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەو نەهێشتنی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لەناو خاکی یۆناندا، بەدڵنیاییەوە ئەو ئاشوبەی گاورەکان لەیۆناندا دژی دەوڵەتی ئیسلامی هەڵیانگیرساند، بووە هۆی لاوازکردنی دەوڵەت و سەرەنجام عوسمانییەکان بەهۆکاری ئەو شکستەوە تەنازولیان بۆ ڕووسیای قەیسەری کرد، بەو هۆیەوە عوسمانییەکان دەستیان هەڵگرت لە زۆرێك لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان و دایان بە ڕووسیا، هەروەك بەهۆکاری ئەو شکستەوە بوو وڵاتی شام و میسر لەو دەوڵەتە ئیسلامییە دابڕان و سەرئەنجام ئەو دوو ناوچەیە کەوتنە ژێر ڕکێفی بەکرێ گیراوێکی وەك محمد علی پاشا.

بە هەمان شێوە ئەو ڕۆڵە بەڕوونی لـە ئـاژاوە بەردەوامـەکانی گاورەکانـدا دەردەکەوێت لە ئەرمینیاو جۆرجیادا، بـەردەوام وەك دوژمنێکـی سەرسـەخت سەیری دەوڵەتی عوسمانییان دەکردو ڕزگار بوونیان لەو دەوڵەتـە بـە پێویـست دەزانی، هەروەها ئەو ڕۆڵەی گاورەکان دەردەکەوێت لە شوێنی ئاهەنگ گێڕانی ماسۆنیەکاندا کە هێنابوونیانە ناو وڵاتی ئیسلامەوەو ئەمـەش هاوکـات بـوو لەگەڵ هێرشی فەڕەنسییەکان بۆ سەر میسر.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین ئەم (محافلانـە) لەلایـەن گاورەکانـەوە هێنرانـە وڵاتی ئیسلامەوەو ئیدی لەوەبەدوا ئەفکاری "عەلمانی و قەومی" هێنرانە نـاو کۆمەڵگای ئیـسلامییەوە، لەڕاسـتیدا ئامـانجی سـەرەکییان بریتـی بـوو لـە بلاوکردنەوەی (بێ ڕەوشتی، ئازادی ئافرەت، دیموکراسی، یەکسانی ئـافرەت و پیاو، بلاوکردنەوەی بێ دینی و، سەرهەڵدانی پارتی عەلمانی و قەومی) لـەناو خاکی ئیسلامدا، تەنهاو تەنها ئەمانە نەخشەو پیلان بوون بۆ لێدانی ئیسلام و موسڵمانان و سڕینەوەی (عقیدة الولاء والبراء) لەناو موسـڵماناندا، پێویـستە ئاگاداری ئەوە بین فیکر(هزر)ی نەتەوەیی عەرەبی لە بنەڕەتدا لـە بەیروتـەوە سەری هەڵدا لەسەر دەستی کۆمەڵە گاورێکی وەك (بطرس البـستانی، أبـراهیم الیازجی) و غەیری ئەمانیش، ئەم کەسانە لـە گـاورە بـەناو بانگـەکانی ئـەو سەردەمەی بەیروت بوون.. `

## دووەم: ڕۆڵی جوولەکە لە کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیدا

ئەگەر گاورەکان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوبێت لە کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیدا، بێگومان جولەکەکان خاوەنی ڕۆڵێکی گەورەو پیسترو کاریگەرتر بوون لەو خیانەتە مێژووییەدا.

ئەمەش لەبەرئەوە بوو گاورەکان پشتیان بەسیاسەتی شۆڕش و هێز دەبەست، ئامانجی سەرەکییان تێك شکاندنی دەوڵەت بوو لەڕووی سەربازییەوە، بەڵام جولەکەکان بەپەنهانی کاریان دەکرد لە ناو جەستەی دەوڵەتی ئیسلامیدا، بەردەوام وەك خۆرەیەك لە کەمیندا بوون لە بۆ ڕووخاندنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەو، هیوا خوازبون هەموو ڕێکخراوەکان و بیروبۆچوونە ڕووخێنەرەکان بەو بۆنەیەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە هەوڵدابن بۆ ڕووخاندنی ئەو دەوڵەتە مەزن و گەورەیەی جیهان، سەرەڕای ئەو هەموو چاکانەی عوسمانییەکان بەرامبەر جوولەکە کردیان، ئەمەش لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانوونی دا بوو کە لەساڵی "٩٧٤" ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین دادگایەکی پشکنین دانرا لە ئەندەلوس بۆ موسڵمانان و جولەکەکان، لەو دادگایەدا هەموو وڵاتان ڕەتیان کردەوە پێشوازی لە سەدان هەزار جوولەکەی دەرکراو بکەن، ئەوەش بە هۆکاری خراپی کردارو ناوبانگیان لە خراپەکارییدا، سوڵتان سلێمان لەگەڵ ژنێکی

جوولەکەدا هاوسەرگیری ئەنجام دابوو بەناوی ڕوکسلان، ئەو وای لە سولتان سلێمان کرد پێشوازی لە جوولەکەکان بکات و لەناو ولاتدا جێگەیان بکاتەوە، تەنانەت ڕێك کەوت لەسەر ئەوەی مۆڵەتیان بدات بەجێگیربوونیان لە ولاتدا، دواجار لە ئەنازۆل و بەتایبەتی لە ناوچەکانی (ئەزمیر، سالانیك، أدرنە) دا نیشتەجێ بون.

جوولەکە بەڕێژەیەکی زۆر سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت و پلەوپایەی گرنگیشیان پێ درا، هەروەك سەروەت و سامانی زۆریان هاتە دەست و دەوڵەمەند بوون و زۆر بەئازادی و خۆش گوزەرانییەوە ژیانیان دەگوزەراند.! دەبێت وەلاَم دانەوەی ئەوان بەرامبەر ئەو چاکانە چی بێت؟ وەچۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگاکەیان کردبێت..؟!!

جولەکەکان دەستیان کرد بەپێکهێنانی کۆمەڵێکی تایبەت بە خۆیان مەبەستیشیان تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان و بانگەشە کردن بوو بۆ کۆکردنەوەی جولەکە لە سەرتاسەری ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا، بۆ ئەوەی قودس بکەنە بارەگای سەرەکی خۆیان.

ئەوانەی ناسراون بە جولەکەی دۆنمە (اليهودية الدونمة) بانگەواز کارەکەیان (شتبای زیفی) بوو ناوبراو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، فەرمانەکانی خۆی بە ئەوروپاو شام و میسردا بڵاو دەکردەوەو هەروەك بەردەوام وەفدی جولەکەکان دەهاتنە لای بۆ ئەوەی شوێنی بکەون، کاتێك دەوڵەتی عوسمانی بە نیازی سزادان (شتبای زیفی)یان بەند کرد، بانگەشەی

بۆ ئیسلام کردو وای نیشاندا ئەو کەسێکی موسڵمانەو ناوی خۆی نا (محمد البواب)!؟

داوای لە دەوڵەت کرد ڕێگەی پێ بدات تا جولەکەکان بانگ بکات بۆ ئەوەی موسڵمان بن، (شتبای زیفی) لەژێرەوەو بەنهێنی جوولەکەیەکی تەواو بوو، بەردەوام کاری لە بەرژەوەندی زایۆنییەکان بەشاراوەیی ئەنجام دەدا، هەروەك لە ڕواڵەتیشدا خۆی بە موسڵمانێکی دڵسۆز نیشان دەداو وەها خۆی بەکۆمەڵگا دەناساند، ئەو سەربازێکی دڵسۆزی ئەم ئیسلامەیە، ناوبراو بزووتنەوەکەی خۆی ناونا (یهودیة الدوغة) ئەم پارتەش بزووتنەوەیەکی سیاسی بوو، بەرەنگاری دەوڵەتی عوسمانی دەکرد زیاتر لەوەی بزووتنەوەیەکی ئاینی بێت، واتە خۆی وەك پارتێکی ئاینی نەدەناساند.

وەك ئاماژەمان پێدا (شتبای زیفی) بەپاڵپشتی جولەکە پارتێکی دامەزراند، ئەم پارتە چەندین جار بەشێوەیەکی کارا بەشدار بووە لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا:

أ- ڕووخاندنی بەها ئیسلامیەکان لە کۆمەڵگاو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیداو کارکردن بۆ بلاوکردنەوەی بێباوەڕی و بیری ڕۆژئاوایی، هەروەها بانگەشە کردن بۆ خۆ ڕووتکردنەوەی ئافرەتان و تێکەلاو کردنی پیاوان و ژنان بە تایبەت لە خوێندنگەو زانکۆکاندا.

ب- جوولەکەی دۆنمە ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو بۆ سەرخستنی

دوژمنەکانی سولتان عبدالحمید، هەروەك جوولەکەی دۆنمە دەستی کرد بە جم و جوڵ لە ناوچەی سلانیکدا بۆ دوورخستنەوەو لادانی سوڵتان عبدالحمید لە کورسی حوکم، هەر ئەمانیش بوون بیری لاوە موسڵمانەکانیان ژەهراوی کردو هەروەها چوونە ڕیزەکانی سوپای عوسمانییەوە، بە مەبەستی تێکدانی ئەو سوپایەو کۆنترۆڵ کردنی سوپاکەو جێ بەجێ کردنی پیلانەکانیان.

ج- شوێنی ئاهەنگی ماسۆنییان لەناودەوڵەتی عوسمانیدا دامەزراند، وە دروشمی هەڵخەڵەتێنەریان بەکار دەهێنا "وەك: ئازادی، ڕوویەڕوو بوونەوەی چەوساندنەوەو بلاوکردنەوەی دیموکراسی" بۆ سەرنج ڕاکێشانی ساویلکەکان و گرنگی دان بە بیری ڕوخێنەر.

وا دادەنرێت (شتبای زیفی) کە لە ساڵی "١٦٧٨" زاینی کۆچی دوایی کرد، یەکەم کەس بێت بانگەشەی ئەوەی کردبێت فەلەستین بکرێتە نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکە، هەروەك بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی زایۆنی جیهانی دادەنرێت لە پێش (تیوۆدۆر هرتزل) بە"٣٠٠" ساڵ، پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین مستەفا کەمال ئەتاتورك دەدرێتە پاڵ ئەو کۆمەڵە جوولەکە ناپاکانەی دەزانین ماوەی ڕۆڵی ئەو بۆ تێك شکاندنی خیلافەتی عوسمانی بوو.

د- جولەکە کاریگەرییان هەبوو بەسەر کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقییەوەو بەئارەزووی خۆیان تەحەکومیان بەسەر ئەو کۆمەڵەیەدا دەکردو، وەك بوکەڵەیەك چۆنیان بویستایە دەیان جوولاندو هەڵیان دەسووڕان، هەتا پیلانە

گلاوەکانیان سەبارەت بە لابردنی سوڵتان عبدالحمید جێ بەجێ بکەن و دەستوری عەلمانیش پیادە بکەن لە وڵاتدا.

لەم نامەیەی سوڵتاندا کاریگەری جولەکە بەسەر کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقییەوە بەئاشکرا دەردەکەوێت، ناوبراو نامەکەی ئاڕاستەی شێخ (مەحمود ئەفەندی ئەبی شامات) شێخی تەریقەتی شازلی لە دیمەشقدا کردو لە نامەکەی سوڵتاندا هاتووە:

پاش ئەم پێشەکیە ئەوە دەخەمە ڕوو بۆ جەنابت و هەموو ئەو کەسانەی هاو وێنەی جەنابتن، هەروەها بۆ هەموو کەسە بیرمەندو تێگەیشتووەکانی دەوروبەرت، ئەویش ئەم بابەتە گرنگەیەو وەکو ئەمانەتێکی مێژوویە لەسەر شانم، من واز لە خیلافەتی ئیسلامی ناهێنم، بەهۆی چەند هۆکارێکەوە، بێجگە لەوەی من بەهۆی تەنگ پێ هەڵچنینمەوە لەلایەن بەرپرسانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقیەوەو هەڕەشەو گوڕەشەکانی ئەوان ناچارم دەکەن و لەسەرمی پێویست دەکەن، دواجار واز لە خیلافەت بهێنم.

ئەم کۆمەڵەی ئیتیحادیانە زۆر پێداگری لەسەر ئەوەی دەکەن، من ڕەزامەندی دەرببڕم لەسەر دامەزراندنی نیشتیمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە فەلەستیندا، لەگەڵ ئەوەدا ئەوان زۆر جەخت لەسەر ئەم داواکاریە نابەجێیە دەکەن، من بەشێوەیەکی یەکجاری دژی ئەم داوایەی جولەکەکان وەستاوم و بەهیچ شێوەیەك داوایەکی ئەوتۆ قبوڵ ناکەم، پاشان جولەکە کاتێ هەستیان کرد داواکەیان جێ بە جێ ناکەم، بەڵێنی ئەوەیان

پێدام"١٥٠" ملیۆن لیرەی ئاڵتونیم بدەنێ، وەك بەرتیلێك بەرامبەر پێدانی بەشێك لە خاکی فەڵەستین بە جولەکە، دووبارە ئەم داواکاریەشم ڕەت کردنەوە، بەم شێوەیەو بەشێوەیەکی ڕەسمی وەڵامم دانەوەو پێم ڕاگەیاندن: نەك "١٥٠" ملیۆن لیرەی زێڕ، تەنانەت ئەگەر هەموو دونیا هی ئێوە بێت و بمدەنێ، لەبەرامبەر ئەوەدا بەشێك لە خاکی فەڵەستینتان بدەمێ، ئەوا داواکەتان بەرپەرچ دەدەمەوە، من زیاد لە"٣٠"ساڵە بە دڵسۆزییەوە خزمەتی میللەت و ئوممەتی (ﷺ) دەکەم، هیچ کات نەبومەتە هۆکاری ڕەشکردنەوەی لاپەڕەکانی مێژووی موسڵمانان و باوباپیرانم لە دەستەلات داران و خەلیفەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لەبەرئەوە بەهیچ شێوەیەك داواکەتان قبوڵ ناکەم .

لەپاش ئەوەی بەو شێوازە بەرپەرچی جولەکەکانم دایەوە، ئیدی پێکهاتن لەسەر دورخستنەوەم لە کورسی خیلافەت و، پێیان ڕاگەیاندم بەوەی دورم دەخەنەوە بۆ "سەرانیك"، منیش پێشوازیم لەم هەنگاوەیان کردو لەکارلابردن و دورخستنەوەم بەلاوە زۆر باشتر بوو لەوەی ئەو شەرمەزارییە مێژووییە بهێنم بەسەر خۆمدا کە ئەویش فرۆشتنی خاکی فەلەستین بوو بە جولەکە .

لەبەرئەوە من زۆر سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەم کە ئەوەم قبوڵ نەکرد، دەوڵەتی عوسمانی و جیهانی ئیسلامی بخەمە ژێر باری کارێکی قێزەون و خراپ و نەویستراوەوە، ئەویش داواکاریە یەك لە دوای یەکەکانی

جولەکە بوو بەوەی ڕێگەیان پێ بدەم دەوڵەتی جولەکە لە ناوچە پیرۆزەکانی فەڵەستین دا دابمەزرێنن ...

دووبارەی دەکەمەوە بەردەوام سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەم، من دڵنیام ئەم هەوڵ و تێکۆشانەم سەبارەت بەم بابەتە گرنگە داومە بەسە بۆ شایەتی دان لە سەر ئەوەی من چەند بەتەنگ کێشەی فەڵەستینەوە بووم، بەم شێوەیەش کۆتایی بە نامەکەم دەهێنم..

والسلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە

خزمەت گوزاری مسوڵمانان

عبدالحمید کوڕی عبدالمجید

خوێنەری بەڕێز ئەمەیە هەڵوێستی سەربەرزانەی سوڵتان عبدالحمید سەبارەت بەکێشەی فەڵەستین، ئەم هەڵوێستانەی ناوبراو بوونە هۆکاری سەرەکی هەتا دواجار ئەو لە کورسی حوکم دوور بخەنەوە، هەروەك نوسەری جولەکە(برنارد لویس) لەکتێبەکەیدا "دامەزراندنی تورکیای نوێ" دا دەڵێت: برا ماسۆنی و جولەکەکانمان بەنهێنی و پێکەوە کاریان دەکرد بۆ لابردنی سوڵتان عبدالحمید لە کورسی حوکمدا، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە سوڵتان عبدالحمید زۆر دژایەتی جولەکەی دەکردو تەنانەت پێدانی یەك بستە خاکی فەڵەستینی بە جولەکە ڕەت کردەوە.!

هەروەها دکتۆر (سیف الدین البستانی) دەڵێت: ماسۆنیەکان بەکردار بەشداربوون لە لاوازکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیداو، ڕۆڵ و کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لە شۆڕشی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە لایەك، هەروەها بەشداری کردن و ڕۆڵ بینینیان لە شۆڕشی "٣١" ی مارتی "١٩٠٩" دا لە لایەکی ترەوە، ئەمەش لەڕێی پشتگیری کردن و یارمەتی دانی شێخ و دەسەڵاتدارە سادەو ماف خوراوەکان بەبیانوی ئەوەی یاسای یەکسانی لەنێوان ئاین و مەزهەبەکان جێ بە جێ دەکەن.

"موئیز کۆهین"ی جولەکە دیارترینی ئەو بیریارانەی جولەکە بوو کە لە ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، ئەو لەناو گۆڤارو ڕۆژنامە تورکییەکاندا بە زمانی تورکی خەریکی بلاۆکردنەوەی بیروبۆچونەکانی بوو سەبارەت بە کاروچالاکیەکانیان بە ئاراستەی دروستکردنی نیشتیمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە ناوچە پیرۆزەکانی فەلەستیندا، هەمانکات ئەندامێکی کۆمەڵەی ئیتیحادوتەرەقی بوو.

"موئیز کۆهین" بەداڕێژەری سیاسەتی ڕەگەزپەرەستی نەتەوەیی (تۆرانی) دادەنرێت، وە کتێبەکەی کە دەربارەی نەتەوەی (تۆرانی) نوسیویەتی، کتێبێکی ترسناکە سەبارەت بەسیاسەتی (تۆرانی) کە خیلافەتی عوسمانی ڕووخاند، (موئیز کۆهین) پیلانێکی ترسناکی پیادە دەکرد بەتایبەت لەناو سوپای دەوڵەتی عوسمانیدا.

شایانی باسە بەپێی سیاسەتی ڕەگەزپەرەستی (تۆرانی) پێویستە

دەوڵەتێکی تورکی (تۆرانی) دابمەزرێت و هەموو تورکەکانی جیهان لە دەوڵەتێکدا کۆبکاتەوەو وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بکرێنە تورك؟!

هەروەها فیکری کۆمەڵگای ئیسلامی پوچەڵ کردەوەو، جولەکەکان جەخت لەسەر ڕۆڵی خۆیان دەکەنەوە لەتێکشکاندنی خیلافەتی عوسمانیدا، ئەویش بەناردنی یەکێك لە گەورە پیاوانی جولەکە ئەویش بریتی بوو لە (ایمانیول قراصو) ناوبراو مامۆستایەکی گەورەی ماسۆنیەکان بوو، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی ئیتیحادو تەرەقی و، ئەندامی ئەو شاندە بوو کە چاویان بە سوڵتان عبدالحمید کەوت و بڕیاری لادانیان لە کورسی حوکم پێ ڕاگەیاند، ئەمەش وەکو تۆڵە سەندنەوەیەك لەوەی سوڵتان عبدالحمید ڕەتی کردەوە جولەکە لە فەلەستین دا نیشتەجێ بکرێت، لەو بەیاننامە نهێنییەی بووە هۆی ئەنجامدانی کۆدەتای سەربازی و دوورخستنەوەی سوڵتان عبدالحمید لە حوکم تیایدا هاتووە:

دانوستانەکان دەستیان پێ کرد لە پاش ئەوەی سەربازە مەقدۆنیەکان چوونە ناو پایتەختەوە، شایانی باسە ماسۆنیەکان ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبوو لە گرتنی پایتەختداو داڕنینی دەسەڵات لە سوڵتان عبدالحمید، ناوبراو بەردەوام زۆر توند بوو لە بەرامبەر ماسۆنیەکاندا؟

چونکە سوڵتان عبدالحمید ماسۆنیەتی بە کۆمەڵەیەکی سیاسی نهێنی مەترسیدار دەزانی، لەبەیاننامەکەدا هاتووە: دوای ئەوەی کۆتایی بە فەرمانڕەوایەتی سوڵتان عبدالحمید هێنرا، ڕۆژنامەکانی جولەکە بە گەرمی

پیرۆزبایی خۆیان ڕاگەیانـد بەبۆنـەی کۆتـایی هێنـان بـە فـەرمان ڕەوایـی (سولّتان عبدالحمید) کە بە چەوسێنەری جولەکە ناویان دەبرد، ئەم بوختانەی ئەوان بۆ سولّتان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە سـولّتان عبدالحمیـد دووجـار داواکاری (هرتزل)ی جولەکەکانی بەرپەرچ داوەتـەوە، (هرتـزل) ئـەو کەسـە ڕەگەز پەرەستە بـوو کتێبـی( دەوڵـەتی جولەکـە)ی دەرکـرد، ئـەم کتێبـە بەخاڵێکی گۆڕانکاری لە مێژووی زایۆنیەتدا دادەنرێت.

لە ساڵی "١٨٩٧" دا (هرتزل) یەکـەم گـۆنگرەی زایـۆنی (بـازل)ی لـە سویـسرا بەسـت، لـەو کۆنگرەیـەدا بڕیاریـدا بەدروسـتکردنی دەوڵـەتێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە فەلەستیندا، ئەمـەش یەکـەمین قۆنـاغی دروسـت کردنی دەوڵەتی جولەکەیە لە نیلەوە بۆ فـورات، هـەمانکات لـە گـۆنگرەی زایۆنیەکاندا کە لە کانونی یەکەمی ساڵی "١٩٠٩" بەسترا، (هرتزل) داوای کرد کۆچی زایـۆنیزم بـۆ هـەموو وڵاتـانی جیهـان بوەسـتێنرێت جگـە لـە فەلەستین!؟

ئەم بەڵگەنامە نهێنیە لە گۆڤاری (الآفاق العربیـة) لە ژمارەی نۆهـەمی ئایاری "١٩٧٨" دا بڵاوکراوەتەوە، وەفەیلەسوف (ماسـۆنی ـ شـاریبا) لـە ئاهـەنگێکی ماسـۆنییەکاندا دەڵێت: سـەیری بـرا ماسـۆنیەکانتان بکـەن هەسـتان بەئەنجامـدانی بزووتنەوەیـەکی دەسـتوری کـە بـووە هۆکـاری کۆدەتاکردن بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا لەسەردەمی فەرمان ڕەوایی سـولّتان عبدالحمیددا بەبێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن بڕژێت !!.

هەروها لە یادەروەرییەکانی (هرتزل)دا هاتووە: هرتزل ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە ناشیرینکردنی کەسایەتی سوڵتان عبدالحمید دا، هەمانکات هرتزل دەورێکی باڵای هەبووە لە دوورخستنەوەی سوڵتان لە کورسی فەرمان ڕەوایی، هەروەها سەرجەمی ئەو کتێبانەی دژی سوڵتان عبدالحمید نوسراون و، بەخراپە باسی کەسایەتی سوڵتان دەکەن، هەموو ئەو کتێبانە بەپیلان و نەخشەو پشتگیری جولەکە نوسراون، بەردەوام جولەکە هەوڵیانداوە کەسایەتی سوڵتان عبدالحمید بشکێنن، لەبەرئەوە بەبێ شەرم کردن دەیان بوختان و درۆیان داوەتە پاڵ سوڵتان عبدالحمید، بوختانی ئەوتۆیان داوەتە پاڵ ئەم سوڵتانە، بەخوێندنەوەی هەست بەشەرمەزارییەکی زۆر دەکەیت، ئەگەر بپرسین بۆچی جولەکە ئەو درۆ شاخدارانە دەدەنە پاڵ سوڵتان؟ وەڵامەکەی زۆر ئاشکرایە، چونکە سوڵتان عبدالحمید ئامادە نەبووە تەنانەت لە بستێك خاکی فەڵەستین خۆش ببێت و بیداتە جولەکەکان .

وە لە ژمارەی "١٧٢" ی گۆڤاری فەتح دا کە لە "٥" ی جەمادی دووەمی "١٣٤٨" ی کۆچیدا دەرچوەو تیایدا هاتووە: کۆدەتاکەی ساڵی "١٩٠٨" ی تورکیا کۆدەتایەکی زایۆنی بوو، ئەمەش لە پێناو دورخستنەوەی سوڵتان عبدالحمید لە کورسی فەرمان ڕەوایی، هەتا گۆڕەپانەکەیان بۆ چۆڵ بکرێت و دەست بدەنە جێبەجێ کردنی پیلانە گڵاوەکانیان، یەکەم کاریان داگیرکردنی فەڵەستین و دروستکردنی دەوڵەتی قەوارەی زایۆنیە.

کاتێك دەڵێین زایۆنی دەستی هەبووە لە کۆدەتای ساڵی "١٩٠٨" دا بەڵگەمان بەدەستەوەیە ئەویش هەبوونی دوو گەورە بەرپرسی جولەکەیە لەو کۆدەتایەدا، یەکێك لەو کەسانە (قرەصو)ی جێگری گشتی زایۆنیزمە لە تورکیا، هەروەك ناوبراو زانایەکی گەورەی جولەکەیە بەڵام ئەنوەر شەوکەت..هتد، ئەوانە کەسانێکی بێ نرخ بوون و بەدەستی خۆیان مێژویەکی ڕەش و بێزراویان بۆ خۆیان نەخشاندووە! لە جەنگی بەڵقانیشداو بەنەخشەو پیلانی جولەکە، کە لەو سەردەمەدا جولەکەکان وەزارەتیان بەدەستەوە بوو، لەجیاتی ئەوەی چەك و تەقەمەنی بخەنە ناو گەنجینەی سەربازەکانی جەنگەوە، بەئەنقەست دەچون عەترو سابونیان دەخستە ناو گەنجینە سەربازییەکانەوەو ڕەوانەی بەرەکانی شەڕیان دەکردن.!؟

گومانی تێدا نیە ئەو جەنگە جولەکەی لەپشتەوە بوو، جەنگی یەکەمی جیهانیش جەنگێك بوو لەلایەن جولەکەو زایۆنیزمەوە هەڵگیرسێنراو ئەنجامەکەشی لە خزمەت جولەکە و زایۆنیدا بوو؟ چونکە چەك بە بێ بونی ماڵ و دارایی کاریگەری زۆری نیە، ئەوەندە بەسە بۆ جولەکە یەکێك لە دەسکەوتەکانیان پاش ئەو جەنگە کە بەدەستیان هێنا ئیمزاکردنی بەڵێنە شومەکەی بەلفۆڕ بوو!.

جولەکە لە مێژوودا بەردەوام لە هەوڵدا بوون بە ئاڕاستەی دابڕین و داگیرکردنی بەشێك لە خاکی فەڵەستین و کردنی بەنیشتمانێك بۆ خۆیان، لەسەردەمی خیلافەتی عوسمانییەکانداو بەتایبەتی تر لە ساڵانی کۆتایی

تەمەنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیەدا، بەردەوام لە هەوڵی چڕدا بوون تا بە هەر نرخێك بووە، بەشێك لە خاکی فەڵەستین داگیربکەن و لە هەموو ناوچەکانی جیهانەوە کۆچی بۆ بکەن و یەکەم دەوڵەتی جولەکەی تیادا دابمەزرێنن، بۆ ئەم مەبەستەو لە سەردەمی دەسەڵاتداری سوڵتان عبدالحمیددا چەندین نوێنەریان ناردوەتە لای سوڵتان، هەتا بە هەر نرخێك بووە قایلی بکەن بەمەبەستی ڕێگەدان بە نیشتەجێ بونی هەمیشەیی جولەکە لە قودس و ناوچە پیرۆزەکانی فەڵەستیندا.

بەڵام لە سەرجەمی هەوڵەکانیاندا شکست دەهێنن، بۆ هەمان مەبەست و لە ساڵی "١٩٠٢" دا وەفدێکی سێ کەسی جولەکە بە سەردانێك خۆیان گەیاندە لای سوڵتان عبدالحمید، پاش ئەوەی ئەو وەفدە لە لایەن تەحسین پاشاوە پێشوازییان لێ کراو داوای لێ کردن مەبەستی هاتنیان بۆ لای سوڵتان بخەنە ڕوو، بەڵام وەفدەکە هەر پێداگرییان لەوە دەکرد مەبەستەکەیان لە تەحسین پاشا بشارنەوەو دەیانویست ڕاستەوخۆ چاویان بەسوڵتان عبدالحمید بکەوێت و لەلای خۆی مەبەستەکە بخەنە ڕوو، بەڵام تەحسین پاشا بەڵێنی پێ دان داواکەیان وەکو خۆی بگەیەنێتە سوڵتان.

لەبەرئەوە داوای لە وەفدەکە کرد داخوازیەکانیان بکەنە نامەیەك هەتا وەك خۆی بگەیەنرێتە سوڵتان. لەو نامەیەدا هاتبوو جولەکە ئامادەییان تیادایە بۆ جێ بە جێ کردنی ئەم خاڵانە:

١- بژاردنی هەموو قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

٢- دروستکردنی کەشتی گەلێکی سەربازی بەمەبەستی پاراستن و بەرگری کردن لە دەوڵەتی عوسمانی.

٣- پێدانی قەرز بەبڕی "٣٥" ملیۆن لیرەی ئالتونی بە دەوڵەتی عوسمانی، بێ ئەوەی هیچ زیادەیەکی بخرێتە سەر، ئەمەش لەپێناوی بوژاندنەوەی بواری دارایی دەوڵەت و گەشەپێدانی بەرهەمەکانیدا.

لەبەرامبەر ئەم سێ خاڵەدا جولەکە داواکاری و ئامانجی خۆیان دەخەنە ڕوو کە ئەویش بریتیە لە:

أ- ڕێگە بەجولەکەکان بدرێت تا ئازاد بن بەوەی کەی ئارەزویان کرد سەردانی فەلەستین بکەن .

ب- ڕێگە بە جولەکەکان بدرێت بە دروستکردنی کۆمەڵگەیەك لە نزیك قودسی پیرۆزەوە، تا ببێتە جێگەی مانەوەو حەوانەوەی ئەو جولەکانەی کە بۆ سەردان و گەشت دێنە ناوخاکی فەلەستین .

ئەم داخوازیانەی وەفدەکەی جولەکە، لەلایەن تەحسین پاشاوە گەیەنرایە سوڵتان عبدالحمید، پاشان تەحسین پاشا بەم شێوەیە وەڵامی جولەکەکانی دایەوە کە لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە ئاراستەیان کرابوو :

١- قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی ناتەواوی و نەنگی نیە بۆ دەوڵەت؟ چونکە دەوڵەتانی وەکو فەرەنساش دووچاری قەرزاری بوونەتەوە، ئەمە بەهیچ شێوەیەك زیان بە ناوبانگی دەوڵەتی عوسمانی ناگەیەنێت .

٢- قودسی پیرۆز یەکەمین جار لە لایەن عومەری کوڕی خەتتابەوە فەتح کراوە، من هەرگیز ئامادەیی ئەوەم تیادا نیە ئەو شورەییە مێژووییە لەئەستۆ بگرم بەوەی فەڵەستین و قودس بفرۆشم بەجولەکە، ئەوە بەخیانەت دەزانم لە بەرامبەر ئەو سپاردەیەی خراوەتە سەرشانم، من ڕاسپێردراوم هەتا ببمە پارێزەری خاك و سەروەت و سامان و ناموسی موسڵمانان.؟

٣- بەجولەکەکانی ڕاگەیاند پارەو سامانی خۆتان بۆ خۆتان، دڵنیای کردنەوە کە دەوڵەتی ئیسلامی ئامادەیی ئەوەی تیا نیە لە سەنگەرێکدا بەرگری بکات کە بەپارەی دوژمنانی بونیات نرابێت.

سوڵتان لە کۆتاییدا داوای ئەوەی کرد بوو، دەستبەجێ ئەو وەفدە بکرێنە دەرەوەو ئیدی بەهیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێ نەدرێت بۆ ئەو مەبەستە بێنە ناو کۆشکی سوڵتانەوە.

لەکۆتاییدا پێویستە ئاماژە بە یادەوەریەکانی (هرتزل) بدەین سەبارەت بەهەوڵە بەردەوامەکانی، هەتا ڕەزامەندی سوڵتان عبدالحمید وەربگرێت بۆ نیشتەجێ کردنی جولەکە لەخاکی فەڵەستیندا، ناوبراو بۆ ئەو مەبەستە دوجار توانیویەتی چاوپێکەوتن لەگەڵ سوڵتان عبدالحمید دا ئەنجام بدات، لەڕێگەی شا(غلیسوم)یشەوە سەردانی دەوڵەتی کردووەو بەفەرمی ئەم داواکاریەی ناڕاستەی سوڵتان عبدالحمید کردوە.

هەروەها (هرتزل) بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی کردوە بە وەزیری

موستەعمەراتی بەریتانیاو پاشای ئیتاڵیاو قەیسەری ڕوسیاو ڤاتیکانەوە، هەمانکات پەیوەندی بە ئەمریکاو چەندین کەسایەتی و دەوڵەتی ترەوە کردووە، ئەمەش لەپێناو قایلکردنی سوڵتان عبدالحمید، هەتا لەڕێی ئەو پادشاو وڵاتانەوە سوڵتان ڕازی بکرێت بۆ ئەوەی ڕێگە بەجولەکەکان بدات بەرەو فەڵەستین کۆچ بکەن و، بە یەکجاری لەو خاکەدا بمێننەوە، بەڵام سەرئەنجام هەموو هەوڵەکانیان بێ ئەنجام مانەوە.

لەکتێبی یادەوەریەکانیدا (هرتزل)، ئاماژە بە بەرپەرچ دانەوەی داواکەی دەکات لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە، تیایدا هاتووە:

سوڵتان بە گاڵتەجارییەوە بە(هرتزل)ی ڕاگەیاندووە: ئامۆژگاری (هرتزل) بکەن سەبارەت بەم بابەتەی بۆی هاتووە با ڕێوشوێنی پێویستی تری بۆ بگرێتەبەر! من ناتوانم چاوپۆشی تەنانەت لە بستە خاکێکی فەڵەستین بکەم؟ چونکە ئەم خاکە موڵکی من نیە! بەڵکو موڵکی گەلەکەمە لە فەڵەستین، گەلەکەم بە بەردەوامی لەپێناو ئەم خاکەدا خەبات و کۆششی کردوەو بەخوێن پارێزگارییان لێی کردووە، ئامۆژگاری جولەکە دەکەم بەوەی خۆیان بپارێزن..ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان حکومەت و دەسەڵاتەکەم لەناوچوو، ئەوا جولەکە دەتوانن خاکی فەڵەستین بە خۆڕایی و بەبێ بەرامبەر داگیر بکەن!! بەڵام تا من زیندوو بم و دڵم لێ بدات و گیان لەجەستەمدا بێت هەرگیز ئەوە قبوڵ ناکەم خاکی فەڵەستین دابڕێت و جیابکرێتەوە لە دەسەڵات و ئیمپراتۆریەتەکەم، ئەوە شتێکە هەرگیز ناهێڵم بێتە دی.

سولّتان هەربەوەنـدە وازی نـەهێنا داخـوازی و داواکارییـەکانی جولەکـە بەرپەرچ بداتەوە، کەسەبارەت بەفەڵەستین ئاڕاستەی سـولّتانیان کردبـوو، بەڵکو ئاماژەی بەمەترسییەکانی جوڵانەوەی زایۆنیزم داو، هۆشداریدا لەمەڕ مەترسی و هەڕەشەکانی ئەو جوڵانەوەیە بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی بەگشتی و ناوچەکانی فەڵەستین بەتایبەتی، بۆ ئەو مەبەستەو لـە پـانزەی تـشرینی یەکەمی ساڵی "١٩٠٠" دا بەیاننامەیەکی بەژمارە "٢٤٠٩" بلاّوکردەوەو ئاڕاستەی هەموو ویلایەت و ناوچەکانی ژێر دەسـەلاّتی دەوڵـەتی عوسمـانی کرد، سەبارەت بە ڕێگە گرتن لە نیشتەجێ بوونی جولەکەکان بەهەمیشەیی لە فەڵەستیندا، ئەو نوسراوە هەرجۆرە کۆچـێکی بەکۆمـەڵی جولەکـەی بـۆ ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی و بەتایبەت فەڵەستین قەدەغە کرد .

هەروەك نوسراوەکە داوای ئەوەیشی کردبوو ڕێگە بە جولەکەکان نـەدرێت سـێ مـانگ زیـاتر لـە فەڵەسـتیندا بمێننـەوە، تەنانـەت سـولّتان پـێش دەسـتپێکردنی جموجوڵـەکانی (هرتـزل) دامودەزگاکـانی دەوڵـەتی لەمەترسییەکانی بزووتنەوەی زایۆنی ئاگادار کردبوەوەو، چەندین بڕیاریـشی دەرکردو داوای لە کارمەندانی مـیری کـرد ئـەو ئەرکـەی لـەم ڕوانگەیـەوە دەخرێتە سەرشانیان بەوردی جێبەجێی بکەن، هەر ئـەو کـات و لـە سـاڵی "١٩٠٢" دا وەزارەتی ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی، ئەو نوسراوەی ئاڕاستەی هەموو ویلایەتەکانی دەوڵەت کردو تیایدا هاتووە:

هەروەك سووربوونی خۆمان ڕاگەیاندووە سەبارەت بەقەدەغەکردنی هاتنە

ناوەوەی جووەکان بۆ ناو خاکی فەڵەستین، بەڵام فەرمانبەران سستی لە جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەدا دەنوێنن، جووەکان بەبیانوی گەشتکردن دێنە قودس و پاشان نیشتەجێ دەبن..مانەوەی ئەو جووانە بەهیچ جۆرێك لە جۆرەکان دروست نیە، فەرمانڕەوایانی دەوڵەت بەرپرسیارن لەوەی دەبێت چی لە توانایاندایە بیخەنە گەڕ لەپێناو بە وردی جێ بە جێ کردنی ئەم بڕیارەدا.

بەهیچ شێوەیەك نابێت ڕێگەی مانەوەی هەمیشەیی بدەنە جولەکەکان، شیاوی ئاماژەیە ئەم بڕیارە ڕێگری لەو جولەکانە ناکات بە تاك یان بە کۆمەڵ دەیانەوێت بە گەشتێکی کاتی سەردانی ناوچە پیرۆزەکانی قودس و فەڵەستین بکەن! بەڵام لە هەمانکاتدا ڕێگەیان پێ نادات بە بەردەوامی لەو ناوچانەدا جێگیر بن، پێویستە لەم بارەیەوە (تعهد) لەو قونسوڵگەریانە وەربگیرێت کە جولەکەکانی لێوە هاتوون، ئەم بڕیارە لەژێر ڕۆشنایی فەرمانەکانی شوراو ئەنجومەنی وەزیراندا دەرچووە.

سەیر لەوەدایە جولەکە بەردەوام داواکارییەکانی خۆیان دوور لەگیانی جەنگ و داگیرکاری و توندوتیژی داوا کردووە، ئەمەش زیاتر لە فێڵێکی ئەو گەلە فێڵبازە دەچێت بۆ گەیشتن بەئامانجە گڵاوەکانیان لەوانەش: ئامادەیی دەربڕینی جولەکە بۆ هاوکاری کردنی سوڵتان عبدالحمید لە ڕوانگەی بەهێزکردنی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپادا، یان دروستکردنی کەشتی گەلێکی سەربازی بۆ پارێزگاری کردن لە دەوڵەتی

عوسمانی، یاخود داواکاری بۆ دامەزراندنی زانکۆیەکی جولەکە لـە قـودس دا، جولەکـە داوای ئـەوەیان دەکـرد بەشـێك لـە خـاکی فەڵەسـتینیان پـێ بفرۆشرێت بە هەر نرخێك بووەو پاشان خۆیان بنیاتی بنێن، یـان ئامـادەیی دەربڕینیـان بـۆ پێـدانی قـەرزی بـێ زیـادە بەدەوڵـەتی عوسمـانی، یـاخود بەڵێندانی جولەکە بۆ بژاردنی قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی کە لـەو کاتـەدا دەوڵەت نوقمی قەرزارییەکی زۆر ببوو، ئەمـەو چـەندین پاداشـت و تـەماع خرایە بەردەم سوڵتان عبدالحمید بۆ ئەوەی لە بەرامبـەردا بەداخوازییـەکانی جولەکە ڕازی بێت کە خۆی لە کۆچ کردنیان دا دەبینێتەوە بۆ فەلەستین.

لەکاتێکدا ئەم پاداشت و مادانە خرانە بـەردەم سـوڵتان عبدالحمیـد کـە دەوڵەتی عوسمانی پێویستی بەکەمترین یارمـەتی هـەبوو، دامودەزگاکـانی دەوڵەت بەدەست نـەبوونی داراییـەوە دەیـان نالاَنـد، هـەژاری، نەخۆشـی، نەخوێندەواری..هتد لەناو گەلدا پەرەی سەند بـوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا سوڵتان عبدالحمید بەپشتیوانی خوای گەورەو بەئارامگری گەلانی موسـڵمان لەسەر ئازارو ناڕەحەتیەکانیان، بەردەوام بەتوندی لەبەرامبەر ئـەم داوایـەی جولەکەکاندا وەستاوەتەوەو بەنەخێر وەڵامی داونەتەوە، هـەر ئەمـەش بـوو بەهۆی ئەوەی جولەکەو ڕۆژئاوا بەهاوکاری دووڕووان و بەکرێ گیراوەکانیان، لەوانەش کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی و پارتی لاوانی تورکیـا هەوڵـەکانیان چڕ بکەنەوە بۆ لادانی سوڵتان عبدالحمیدو ڕوخاندنی خیلافـەتی ئیـسلامی، ئیدی لێرەوە کاربەدەستی موسڵمانان بڕیاری لادانی سوڵتان عبدالحمیدی لـە

کورسی فەرمان ڕەوایی دەرکرد.

شایانی باسە لەو بەیاننامە نهێنیەی بووە هۆی ئەنجامدانی کۆدەتای سەربازی و دوور خستنەوەی سوڵتان عبدالحمید لە حوکم هاتووە:

دانوستانەکان دەستیان پێکرد دوای ئەوەی سەربازە مەقدۆنیەکان چونە ناو پایتەختەوە، ماسۆنیەکان دەورێکی سەرەکییان بینی لە گرتنی پایتەخت و داڕنینی دەسەڵات لە سوڵتان عبدالحمید، ئەو زۆر توند بوو لە بەرامبەر ماسۆنیەکاندا؟ چونکە سوڵتان عبدالحمید ماسۆنیەتی بەکۆمەڵەیەکی سیاسی نهێنی مەترسیدار دەزانی، هەروەك لەو بەیاننامە نهێنیەدا هاتووە: دوای ئەوەی کۆتایی بەفەرمان ڕەوایەتی سوڵتان عبدالحمید هێنرا، ڕۆژنامەکانی جولەکە بە گەرمی پیرۆزبایی خۆیان ڕاگەیاند بەبۆنەی دورخستنەوەی سوڵتان لە کورسی فەرمان ڕەوایی کە بە چەوسێنەری جولەکە ناویان دەبرد، بێگومان ئەم بوختانەی ئەوان بۆ سوڵتان لەوەوە بوو سوڵتان دوجار داواکاری(هرتزل) ی جولەکەکانی بەرپەرچ داوەتەوە بەئاڕاستەی دروستکردنی نیشتیمانێك بۆ جولەکە لەخاکی فەلەستین دا، بیرمان نەچێت (هرتزل) کتێبی (دەوڵەتی جولەکە)ی نوسی، ئەم کتێبە بەخاڵێکی گۆڕانکاری لە مێژووی زایۆنیەتدا دادەنرێت.

لە ساڵی "١٨٩٧" دا (هرتزل) یەکەم گۆنگرەی زایۆنی (بازل) ی لە سویسرا بەست، بڕیاریدا بەدروستکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە فەلەستین دا، ئەمەش یەکەمین قۆناغی دروستکردنی دەوڵەتی جولەکەیە لە

نیلەوە بۆ فورات، هەروەها لە گۆنگرەی زایۆنیەکاندا کە لە کانونی یەکەمی ساڵی "١٩٠٩" بەسترا، داوای کرد کۆچی زایۆنیزم بۆ هەموو وڵاتانی جیهان بوەستێنرێت جگە لە فەڵەستین!.

ئەم بەڵگەنامە نهێنیە لە ژمارەی نۆهەمی ئایاری "١٩٧٨" داو لە گۆڤاری (الآفاق العربية) بڵاوکراوەتەوە، ئەوەتا فەیلەسوف "ماسۆنی ـ شاریبا" لە ئاهەنگێکی ماسۆنیەکاندا دەڵێت: سەیری برا ماسۆنیەکانتان بکەن هەستان بەئەنجامدانی بزوتنەوەیەکی دەستوری کە بووە هۆکاری کۆدەتا کردن بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا، لەسەردەمی فەرمان ڕەوایی سوڵتان عبدالحميد دا بەبێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن بڕژێت.!

دوای دەرچوونی بڕیارەکە، چوار بەرپرسی ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی ڕوویان کردە کۆشکی (یەڵدز) کە بریتی بوون لە:

١- عارف حیکمەت[١٥] : پلەدارێکی هێزە دەریاییەکانی دەوڵەتی

---

[١٥]- عارف حیکمەت: پلەدارێکی هێزەدەریاییەکان بوو، هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی ( الاعیان ) بوو، ئەم پیاوە دژی هەموو ئەو پلەو ڕوتبەو چاکانە دەوەستایەوە کە لە لایەن سوڵتان عبدالحميدەوە پێی بەخشرابوون، هەروەها بەشداری کردنی لە ناو ئەو وەفدەدا کە بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە تایبەتە بە سوڵتان هاتبون، تەنانەت عارف حیکمەت بە پشتیوانی سوڵتان عبدالحميد دواپلەشی بە دەست هێنا کە فەرماندەیی هێزە دەریاییەکان بوو. سوڵتان عبدالحميد لەو کاتەدا ڕووی تێ کردو پێی ووت: ئایا عارف حیکمەت تۆم بە هەتیوی لەم کۆشکەدا گەورە نەکرد؟ ئاشکرایە دایکی عارف

عوسمانی بوو.

٢- مزراح ئەفەندی[١٦]: ئەمیش ئەندامی ئەنجومەنی (أعیان) بوو،

---

یەکێك بوو لە کارگوزارەکانی کۆشکی سوڵتان، پاشان سوڵتان عبدالحمید، عارف حیکمەت دەخاتە قوتابخانەی ( سەربازی - دەریایی ) یەوەو دواتر دەینێرێت بۆ ئەوروپا تا پلەی (أركان حرب) ی بەدەست هێنا، بەڵێ بەردەوام سوڵتان عبدالحمید بە گاڵتە جاڕ بیەوە قسەی لە گەڵ عارفدا دەکرد، بێ گومان ئەگەر عارف حیکمەت تۆزێك ویژدان و کەرامەت و ئابڕوی هەبوایە، ئەوا دەست بەجێ لە شەرمدا دەمرد؟ چونکە عارف پەروەردەکراوی کۆشکی سوڵتان بوو، بەلام خیانەتی لە سوڵتان کرد، بە بەردەوامی سوڵتان کارە باشەکانی خۆی وەبیر عارف دەخستەوەو عارفیش لە شەرمەزاریدا نەیدەتوانێ زمان بجوڵێنێ .

[١٦]- مزراح ئەفەندی: ئەم پیاوە پارێزەرێکی جولەکە بوو، لە بنەچەدا خەڵکی ئیسپانیابوو، یەکێك بووە لە ئەندامە باڵاکانی ( اتحاد الترقی ) و بەرپرسی بەشی ڕێکخستنی ئەو کۆمەڵە بووە، ناوبراو ڕۆڵێکی زۆری گێڕا لە ئاسانکاری کردن بۆ داگیرکردنی لیبیا لە لایەن ئیتاڵیاوە، پاش ئەوەی کە تاوانی کۆکردنەوەی سامانی بە سەردا ساغ دەبێتەوە، بەرە و ئیتاڵیا هەڵدێت و ناسنامەی ئەو وڵاتەی پێ دەدرێت، ناوبراو پلەیەکی باڵای لە ماسۆنیەتدا هەبووە، تا ئەو ئەندازەیەی پلەی ئوستازی لە ماسۆنیەتدا بە دەست هێناوە، تا مردنی لە "تریستا" ماوەیەوە کە لە ساڵی "١٩٣٤" کۆچی دوایی کرد، هەروەها لە لایەن بانکی ئیتاڵیاوە چوارسەد هەزار لیرەی ئاڵتونی دراوەتە ئەم پیاوە تا بیداتە دەستی ( نەجیب دراغا )، ئەمیش ئەو بڕە پارەیەی تەسلیمی (ئەیوب سەبری) کرد کە ئەندامێکی ( اتحاد الترقی ) بوو، ئەم پارەیە بۆ ئەوە دابین کرابوو، تا قەسابخانەکەی "٣١" ی ئاداری پێ ئەنجام بدرێت، ئەم قەسابخانەیە کۆتایی بە حوکمی سوڵتان عبدالحمید هێنا، مزراح ئەفەندی خاوەنی ناسنامەی ئیتاڵی و ناسنامەی دەوڵەتی عوسمانیش بوو، مزراح ئەفەندی لە پاش کۆتایی هاتنی حوکمی سوڵتان عبدالحمید بە شانازییەوە دەیووت: ئیتیحادیەکان بە

هەمانکات جولەکەیەکی داخ لە دڵ بوو .

٣- ئرستید [١٧]پاشای (ڕۆمی): ناوبراو وەزیری پێشووی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو .

---

بڕی چوارسەد هەزار لیرە توانییان ئەوە جێ بە جێ بکەن کە دەیان ویست، لەکاتێکدا سوڵتان عبدالحمید نەیدەتوانی بە پێنج ملیۆن لیرەش ئەوە جێ بە جێ بکات، ئیدی لێرەوە ڕێ بە جولەکەکان درا کە بەرە و فەڵەستین کۆچ بکەن و زۆرێك لە بەشداربووان لە کۆمەڵی ( ترکیا الفتاة) بوون، سەرچاوە ئینگلیزەکان بە گەورە بەرپرسانی (اتحاد الترقی) ناویان دەبردن، لە ئەنجامدا بە هۆی ئەنجام دانی ئەو خیانەتە لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو ئیتاڵیا هەڵهاتن، هەمان کات عارف حیکمەت ئەندام پەرلەمانی تورکیاش بووە، هەندێك سەرچاوەش بەوە ناوی دەبەن کە بانگەشەی بۆ بیروبۆچوونی کۆمەڵی ( ترکیا الفتاە) کردووە، لە کۆبوونەوە تایبەتەکانی ماسۆنیەتداو لە پەرلەمانی تورکیادا، مزراح ئەفەندی و باقی ئەندام پەرلەمانە جولەکەکان وا خۆیان پیشان دەدا کە لەبەر بەرژەوەندی تورکیا هەموو شتێك دەکەن، بێ گومان ئەمەش بانگەشەیەکی تەقلیدی جولەکە تورکەکان بوو .

١٧- ئرستید پاشا: ماوەیەك ڕاوێژکاری بواری دارایی بووەو، پاشان وەزیری بەرژەوەندییەکان و دواتر بووە بە ئەندامی (مجلس الاعیان)، ناوبراو هاندەری سەرەکی ئەرمەنەکان بووەو ئەوانی خستۆتە سەر ئەو ڕێگەیەی کەوا بزانن سوڵتان عبدالحمید هۆکاری سەرەکی نەهامەتییەکانیانە، ئەم پیاوە دانی بە هەموو ئەو یارمەتیانەدا ناوە کە لە ڕووی سەربازی ودارابییەوە پێشکەشی ( اتحاد الترقی) کردوون، ناوبراو هەر لە لایەن ئەرمەنەکانەوە دیاری کرا تا سەرۆکایەتی و پێشڕەوایەتی ئەوانە بکات کە دەیانەوێت تۆڵە لە سوڵتان عبدالحمید بکەنەوە، سوڵتان عبدالحمید پرسیاری لێ کردبوو: کێ تۆی کردە ڕاوێژکاری دارایی و پاشان تۆی کردە وەزیرو دواتر بۆ ئەندامێتی پەرلەمان ؟!! ئرستید بێ دەنگ بوو، لەشەرمەزاریدا ووشەیەك لە زاری نەهاتە دەرەوە ..

٤- ئەسعەد پاشا، ئەم پیاوە لە بنچینەدا ئـەلبانی نـەژاد بـوو، نـاوبراو سەرپەرشـتیاری ناوچـەی (دراج) بـوە، سـولّتان عبدالحمیـد زۆر کـاری بـۆ ئەسعەد پاشا ئەنجام داوەو فەزلّی زۆری بەسەریەوە هـەبووە، بـەلاّم ئەسـعەد پاشا خیانەتی لە سولّتان کـردوەو بـەنهێنی ئەنـدامانی ئیتیحـادو تـەرەقی لەناو کۆشکی سـولّتاندا دامەزرانـدوەو، نـاوبراو یـەکێك بـووە لـە کەسـە نزیکەکانی سولّتان عبدالحمید.؟

چـوار کەسـەکە چـوونە نـاو کۆشـکی سـولّتان عـبدالحمیـدەوە، ئـەو زۆر بەگەرمییەوە پێشوازی لێکردن، بەبێ ئەوەی سولّتان ئاگاداری ئەوە بێت ئەم چوار کەسە تاوانبارە نەخشەیەکی دوژەخـی لـە هەگبەیاندایـە بەئاڕاسـتەی ڕماندنی دەولّەت و، لادانی لە کورسی فەرمانڕەوایی، هەرچواریان لەبـەردەم کەسایەتییەکی گەورەی وەك سولّتان عبدالحمیددا وەسـتان، نـەیان ئـەتوانی ڕێگەی توندو تیژی بگرنە بەر، بەلّکو لە گەلّ کارە چـەپەلّەکەیاندا هـەولّیان دەدا بەجوانی هەلّس و کەوت بکەن لەگەلّیدا، هەروەك عارف حیکمەت زۆر بەڕێزەوە سلاّوی لە سولّتان عبدالحمید کرد کاتێ ئەوەی بیرکەوتەوە ڕۆژاینك لەژێر فەرمانی سولّتان عبدالحمیدی گەورەی موسلّماناندا بوەو بە فـەرمانی ئەو هەلّسوکەوتی کردووە، عارف حیکمەت شەرمەزاری دەیگرت کاتێ ئـەو ڕۆژانەی وەبیر دەهاتنەوە، کە ئەو ئەفسەرێك بووە لە ئەفسەرەکانی سـولّتان عبدالحمیدو بەپشتیوانی ئەو پێگەیشت .

بەلاّم جولەکەکە بەشێوەیەکی زۆر بێ ڕێزانە دەستی بەرەو سـولّتان درێـژ

دەکرد "بەیاننامەی لابردنی سوڵتان لە کورسی فەرمان ڕەوایی" بەدەستی جوەکەوە بوو، بەرەو ڕووی سوڵتان ڕای دەوەشاندو بەشێویەکی زۆر بێشەرمانە ڕویکردە سوڵتان و ڕایگەیاند: ئومەت تۆی لە دەسەڵات لابرد!؟ سوڵتانیش وەڵامی دایەوە: بەڵکو ئێوە ئەوەتان دەوێت، ئێوە ئەو قسەیەتان دەوێت، ئێوە دەتانەوێت من لە دەسەڵات دوور بخەنەوە!!

بەڵام ئرستید ڕۆمی و ئەسعەد پاشا بێدەنگییان هەڵبژارد بوو، بەشێوەیەك وەها هەستت دەکرد ئەوان لەسەر ئەم دونیایە ناژین.

سوڵتان بەردەوام بەگاڵتە پێ کردنەوە قسەی لە گەڵ دەکردن و لێی دەپرسین: ئایا ئێوە لە هاوکارانی من نەبوون؟ وەڵامیان بە بەڵێ دەدایەوە؟ پاشان لێی پرسین: کێ ئێوەی کرد بە هاوکاری من و ئەو پلەیەی پێدان؟ هەموویان بێ دەنگ بوون، تەنانەت یەك وشە لە زاریان نەهاتە دەرێ !؟

هەروەها سوڵتان پرسیاری لێ کردن: ئەو بەڵگە شەرعیە کامەیە کردوتانە بەبەڵگە تا بەهۆیەوە من لە دەسەڵات دوور بخەنەوە؟ عارف حیکمەت لاپەڕەیەکی دەرهێنا فەتواکانی شێخی ئیسلامی تێدابوو، سەبارەت بە لەکار لابردنی سوڵتان و تیایدا هاتبوو: کاتێك ئیمامی موسڵمانان ڕاهات بەئارەزوی خۆی هەڵسوکەوت بکات و، لە کتێبە شەرعیەکاندا هەندێك بابەتی شەرعی گرنگ لاببات، یان ڕێگری بکات لە هەندێك بابەت لەو کتێبانەدا، یاخود هەندێکیان بدڕێنێت یاخود بیانسوتێنێت..لێرەدا سوڵتان قسەکەی بە عارف پچڕاندو وتی: (حسبنا الله

ونعم الوكيل) کام کتێبەم سوتاندووە؟

عارف حیکمەت بەردەوام بوو لەخوێندنەوەی فەتواکاندا، بەبێ ئەوەی و کەمترین دانایی و زانیاری هەبێت..لە فەتواکاندا هاتبوو:

سوڵتان عبدالحميد زیادەڕەوی کردووە لە خەرج کردنی پارەی (بیت المال) داو بەهەدەری داوەو، بەشێوەیەکی ناشەرعی هەڵس و کەوتی بەپارەی (بیت المال) کردوە، هەروەها سوڵتان تاوانبار کرابوو بەکوشتن و بەندکردن و دوورخستنەوەی خەڵکی لە وڵات، هەروەك لە فەتواکاندا جۆرەها زوڵم و زۆرو ستەم بەناڕەوا درابویە پاڵ سوڵتان عبدالحميد، سەرجەمی فەتواکانیش ئاماژەیان بەوە دابوو سوڵتان بەبێ هیچ جۆرە پاساوێك هەستاوە بە ئەنجام دانی ئەم تاوانانە..

لە درێژەی فەتواکاندا ئاماژە بەوە کراوە ئەگەر سوڵتان لەم کردەوانەش پەشیمان بێتەوەو داوای لێ بوردن لە خوای گەورە بکات و ڕێگەی چاکسازی و کردەوەی باش بگرێتە بەر، ئەوا دووبارە هەر موسڵمانان دوچاری زیان دەبن بەمانەوەی سوڵتان عبدالحميد لە کورسی دەسەڵاتدا، کۆمەڵێك لەو بڕوایەدا بوون، مانەوەی سوڵتان عبدالحميد لە کورسی حوکمدا زیانێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوەو، دورخستنەوەی سوڵتان لە دەسەڵات ئەگەرەکانی چاکسازی لە وڵاتدا زیاتر دەکات، ئەوان بۆچونیان وەهابو و دەیانگوت پێویستە یەکێك لەو دوو کارە ئەنجام بدرێت، لابردنی سوڵتان لە کورسی فەرمانڕەوایی، یان داوای لێ بکرێت بۆ خۆی واز لە دەسەڵات بهێنێت،

ئەمەش لە ڕوانگەی بڕیارەکانی (مجلس الحل والعقد) ئەو کات دەوری شورای بینیوە، بەبڕوای ئاژاوە چییەکان پێویست بوو سوڵتان یەکێك لەو دوو داوایە هەڵبژێرێت!!

سوڵتان عبدالحمید ڕوویکردە جولەکەکەو ئەوەی وەبیرهێنایەوە کە پێش شەش ساڵ لەمەوبەر هەمان کەسی جولەکە "مزراحی قەرەصو" هاتووەتە لای سوڵتان و داوای لێ کردوە ڕێگە بە جولەکەکان بدات تا لە فەڵەستیندا نیشتەجێ بن، لە بەرامبەر پێدانی بڕێك پارە بەسوڵتانی باوەڕداران .

بەڵێ سوڵتان عبدالحمیدی بریندارکراو بەدەستی ئەم نەفام و سپڵانە، دەیویست ئەم جولەکە تێبگەیەنێت لەوەی ئەمە هەڵوێستی ئێستای ئەو جولەکەیەو سوڵتان لەسەر کار لادەبات، لەکاتێکدا شەش ساڵ لەمەوبەر بەزەلیلی و مەمنونییەوە داوای لە سوڵتان کردووە هەندێك لە خاکی فەڵەستینیان بە کرێ بداتێ تا کۆچ بکەن بۆ فەڵەستین، جولەکە بۆ خۆیان باش دەزانن سوڵتان عبدالحمید، چەند توند بووە لەبەرامبەر بەرگریکردن لە قودس و خاکی پیرۆزی فەڵەستیندا.

وتەکانی سوڵتان عبدالحمید زۆر بەهێزو ڕوون و ئاشکرا بوون، بەبێ ترس قسەی دڵی خۆی دەکرد لە کاتێکدا ڕوویەڕووی ئەوە بوو بوویەوە لەسەر کورسی حوکم لابرێت، لەلایەن دوو کەسەوە یەکێکیان گاورێکی ڕۆمانی بوو، ئەوی دیکەیان جولەکەیەکی ماسۆنی بوو، سوڵتان عبدالحمید بەم شێوەیە کۆتایی بەقسەکانی هێناو ووتی: هاتنتان بۆ ئێرە بۆ ئەوەی

فەرمانی دوورخستنەوەی سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی و خەلیفەی باوەڕداران لە حوکم ڕابگەیەنن، لە داهاتودا ئێوەو ئەوەیشی ئێوەی ناردووە بۆ ئەم کارە دووچاری نەهامەتی و پەشیمانی دەکاتەوە [١٨] .

لە درێژەی وتەکانیدا سوڵتان عبدالحمید ڕایگەیاند (بە درێژایی "٣٣" ساڵ لەپێناو ئوممەت و دەوڵەتی ئیسلامیدا هەوڵ و کۆششم کردووە، لەپێناوی هێمنایەتی و ئاشتی وڵاتدا هەوڵی زۆرم داوە، بەپێی وزەو توانای خۆم خزمەتم کردووە! من لە ژێر ڕۆشنایی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەردا (ﷺ) حوکمی وڵاتم کردووە، من بەو شێوازە وڵات تەسلیم دەکەمەوە کە کاتی خۆی ئەو ئەرکەم هەر بەو شێوەیە پێ درا، وەك خۆی ئەو ئەمانەتە تەسلیم دەکەمەوەو، هەرگیزای هەرگیز بستێك زەوی ئیسلامم فەرامۆش نەکردووە، خوای گەورە ئاگاداره بەهەوڵ و کۆششەکانم، بە پێی توانای خۆم هەوڵم داوەو، مەکرو فێڵی دوژمنانیشم سەر ناگرێت ئەگەر بیانەوێت پەردەی ڕەش بدەن بە سەر خزمەتەکانمدا بۆ وڵات و ئوممەتی ئیسلامی).

پاشان سوڵتان عبدالحمید خۆی ئامادە نەبوو نامەکە لە دەست جوەکە وەربگرێت، لەبەرئەوە فەرمانی بە (دەلی جەودەت) ی هاوکاری کرد نامەکە

---

[١٨]- لە یادەوەرییەکانی سوڵتاندا هاتووە: پاش ئەوەی لە دەسەلات دوور خراوەتەوە، ووتویەتی: ( ئەوان سوڵتان عبدالحمیدیان نەڕوخاندووە، بەڵکو ئەوان دەوڵەتی عوسمانییان ڕوخاند ) دواتر هەست بەم ڕاستەقینەیە کرا.

لە جولەکە ماسۆنیەکە وەربگرێت، ئەویش نامەکەی دا بەدەستی عائیـشەی کچی سولّتان عبدالحمیدەوە، دواجار سـولّتان عبدالحمیـد داوای لـە عـارف حیکمەت و باقی بەرپرسەکان کرد ڕێگەی بدەن تا ئەو تەمەنەی ماویەتی لە کۆشکی (چراخان) لە پەرستشی خوای گەورەدا بەسەری ببات، بەڵام لەلایەن ئەو تاوانبارو سپلانەوە داواکەی سولّتان بەرپەرچ درایەوە.

ئیدی لەمەودوا پەردە درا بەسەر ژیانی ئاشکرای سولّتان عبدالحمیـدداو، لێرەوە ژیانی تاریکی ناو بەندینخانـە دەسـتی پـێ کـرد!؟ پاشـان سـولّتان ڕەوانەکرا بۆ ناوچەی (سالۆنیك) کە ناوجەرگەی جولەکەو ماسۆنیەکان بـوو، لە کۆشکی (علاتینی) بەندیان کرد لـەلای کۆمەڵـەی ئیتحـادو تـەرەقی و جولەکە ئیتالّیەکاندا!.

دواتر عەقید (ڕەزمی) کرا بەسەرپەرشتیاری سولّتان عبدالحمید، هـەموو جۆرە سزایەکی دەرونی لەسەری تاقی کرایـەوە، تەنانـەت ڕێگـەیان نـەدەدا سەیری باخچەی بەندینخانەکەش بکات، هەروەها ڕێگر بوون لەوەی سولّتان چاوی بە خێـزان و منـداڵ و خـزم و دۆسـتانی بکـەوێت!! تـەنها یـەك ڕۆژ ڕێگەیان بەسولّتاندا تا دەرەوەی بەندینخانەکەی ببینێت؟ ئەویش لەبەرئـەوە بوو ئەو ڕۆژە خەریکی ئاهەنگ گێڕان بوون بـۆ"ساندایـسکی "ئـەم پیـاوە دوژمنێکی سەرسەختی سولّتان عبدالحمید بووە.

## ڕمانی خیلافەتی ئیسلامی و سەرەتای نەهامەتیەکان؟!

"٣ی مارسی ساڵی ١٩٢٤" بەخەمناکترین ڕۆژ دادەنرێت لەلای هەموو موسڵمانێکی خاوەن ویژدان؟ چونکە لەو ڕۆژەدا مێژووی ئیسلامی ڕووبەڕووی گەورەترین کارەسات بوویەوە، کە بریتیە لە ڕووخانی گەورەترین و تەمەن درێژترین خیلافەت لەمێژووی ئیسلامیدا، بێگومان ناتوانین ئینکاری ئەوە بکەین هەندێك لە هۆیەکانی ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی ناوخۆیین و پەیوەندییان بە کاربەدەستانی دەوڵەتەکەوە هەیە، بەتایبەت ئەو هەڵە گەورانەی لەدواساتەکانی ئەم خیلافەتەدا ڕوویاندا؟! ئیدی چوونیەکە، ئەو کارانە بەهەڵە، یان بەهۆی نەزانینەوە ڕووبەڕووی ئەم دەوڵەتە ئیسلامیە بوبێتنەوە.

بەداخەوە دواجار هەر ئەو هەلانە بوونە هۆکاری لاواز کردنی عوسمانیەکان، پاشان خاچ پەرەستان و جولەکەو دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بواریان بۆ کرایەوە تا دەستوەردان بکەن، ئەمەش بە ڕمانی دەوڵەتی عوسمانی کۆتایی هات و پاشان بەبێ ئەوەی پرس بە گەلانی موسڵمانی حەساوەی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلامی بکەن، وەك گۆشتی قوربانی ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانییان لەناو خۆیاندا دابەش کرد.

بێگومان لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیدا هەموو شتەکان پێچەوانەوە بوونەوە، ناوچەکە لە یەك ڕژێمی بەهێزی ئیسلامییەوە گۆڕاو دابەش کرا بۆ چەند ڕژێمێکی عەلمانی لە ڕۆژئاواوە هێنراو، ناوچەکە لەژێر دەسەلاتی یەك دەوڵەتی مەدەنی بەهێزی ئیسلامییەوەو بەفیتی ولاّتانی ڕۆژئاوا دابەش کراو پەرت کرا بۆ چەندین دەوڵەتۆکەی بچوك، هەریەکەشیان خرایە ژێر دەستی کەسێکی عەلمانی سەربازی بەکرێ گیراوی خۆرئاوا، سەرەنجام بەتەورو داس و زەبری هێز کەوتنە وێزەی موسڵمانان و بە یارمەتی ڕۆژئاوا کەوتنە دامرکاندنەوەی هەموو ئەو شۆڕشانەی هەوڵی گەڕاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامییان دەدا.

## جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، یەکەمین بەرهەمی ڕمانی خیلافەتی ئیسلامییە!

کۆمەڵەو پارتە نهێنییەکان کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاَت و قەڵەمڕەوی خیلافەتی ئیسلامی عوسمانیەکاندا دروست کران، بە یەکێك لە هۆکارەکانی ڕمانی دەوڵەتی عوسمانی دادەنرێن، یەك لەوانە جولەکەی دۆنمەیە بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو ڕوویان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاَتی عوسمانییەکان کردو ڕیزەکانی خۆیان ڕێکخست، هەرچەندە لە ڕووکەشدا خۆیان بەموسڵمان لە قەڵەمدەدا، بەلاَم لە ڕاستیدا جولەکەی دۆنمە پشتیوانێکی دلسۆزی خاچ پەرەستان بوون و هۆکارێکی سەرەکی بوون لەبلاَوکردنەوەی بەدڕەوشتی و بێباوەڕی لەناو دەوڵەتی موسڵماناندا، هەروەها بە ڕێکخەرو جولێنەری هەموو خۆپیشاندان و ناڕەزاییەکان دادەنرێن کە دژی عوسمانییەکان ئەنجام دەدران.

ئەو کۆمەلاَنە کاریان بریتی بوو لە ئەنجامدانی چالاکی دژی سوڵتان عبدالحمید لەژێر ناوی جۆراو جۆردا، لەو کۆمەڵ و پارتانەش وەك: کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی و، بزوتنەوەی فەتات و.. زۆربەی ئەم پارتانە لەڕووی سیاسی و فیکری و داراییەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن ڕۆژئاواو

جولەکـەوە پـشتگیری دەکـران، هـەروەها لـە ڕووی ڕاگەیاندنیـشەوە لـەو ساتانەدا ڕۆژئاوا پشتگیری تەواوی دەکردن و ئـەوان بەرنامـەی کاریـان بـۆ دادەڕشتن، بەنموونە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لەو سـەردەمانەدا لـە شـاری پاریس ڕۆژنامەیەکیان بۆ چاپ دەکرا، بە ناوی ڕۆژنامـەی (المیـزان) تیایـدا بیروبۆچون و ئامانجی پارتەکەی ڕوون دەکردەوە، هـەروەك بنکـەی سـەرەکی ئەم کۆمەڵەیە لە شاری (جنێف) بوو.

هەروەها کۆمەڵەی ئیتیحادو تـەرەقی کـە زۆرێـك لـە ئەندامـەکانی لـە کەسانی جولەکـە پێکهـاتبوون، بـەردەوام لـە هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی ئـەو بیروبۆچـونانەدا بـوون کـە یـەکڕیزی موسـڵمانانیان تێـك دەدا، بزوتنـەوەی ماسۆنیەتی جیهانی بەشێوەیەکی بەرنامـە بـۆ دارێـژراو دەسـتێکی بـاڵای هەبوو لە دروستکردنی سەرجەمی ئەو کۆمەڵەو پارتانـەدا لـەناو دەوڵـەتی عوسمانیداو، لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەشێوەیەکی بەربڵاو ئـەم پارتە نهێنیانە بەوڵاتدا بڵاوبونـەوە، بەتایبـەت لـە (سـالۆنیك) دا بـەناوی سەربەسـتی و ئـازادی و نیـشتمان پەروەرییـەوە دەسـتیاندایە چـالاکی و بەئاشکرا ئەم کۆمەڵ و پارتانە بوونە هاوکارو پاڵپشتی کۆمەڵەی ئیتیحادو تـەرەقی لـە دژایـەتی کردنـی دەوڵـەتی عوسمانیـدا، دواجـار توانییـان لـە

خۆپیشاندان و ئاژاوەکانی ساڵی "١٣٢٦-١٣٢٧" دا کۆتایی بەحوکمی سوڵتان عبدالحمید بهێنن.

بەداخەوە پێشەکی ئەم ڕووداوە تاڵ و کارەساتبارە بەکەمال ئەتاتورکی چەپەڵ دەستی پێ کرد، بێ گومان بە ڕووخانی خیلافەتی ئیسلامی، بۆ یەکەم جار لەمێژوی ئیسلامیدا ئەم ئاینە لە ژیارو ژیان و کاروباری سیاسەت و دەوڵەتداری جیا کرایەوە، کەمال ئەتاتورك لە مەڕاسیمی کردنەوەی پەرلەماندا کە لە ساڵی "١٩٢٣" دا بوو لەبەردەم ئامادەبووانـدا هاتە گۆ وتی: ئێمە ئێستا لە سەدەی بیست و یەکدا دەژین، ئیدی ناتوانین یاساکانمان لەژێر ڕۆشنایی ئەو کتێبەدا هەڵبهێنجێنین کە باسی هەنجیرو زەیتون دەکات؟!.

کەمال ئەتاتورك گەورەترین دیاری پێشکەشی ڕۆژئاواییەکان کرد ئەویش بریتی بوو لە جیاکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە دەوڵەت و حوکمداری، ئەمەش بوو بەسەرەتای ئەو هەموو کارەسات و نەهامەتی و شکستانەی تا ئێستا بەرۆکی موسڵمانانی بەرنەداوە؟! چونکە بەهێزترین هۆکار کە توانی ئەم ئاینە بکاتە گەورەترین ئیمپراتۆریەت و لەیەك کاتدا ڕوویەڕووی پیلانی خاچ پەرەستان و جولەکەو شیوعیەت و..دەوەستایەوە، تەنها بریتی بوو لە

ئامادەیی ئیسلام لـە هـەموو جومگـەکانی ژیـانی موسـڵماناندا، گـەلانی موسڵمان ئیسلامیان کردبووە بەرنامەی خۆیـان، ئەمەیـە هۆکـاری ئـەوەی توانییان حوکمی نیوەی جیهان بکەن.

بە ڕمانی خیلافەتی ئیسلامی کەمال ئەتاتورك بووە سـەرۆکی تورکیـاو، یەکـەمین هەنگاویـشی بـۆ بەعـەلمانی کردنـی وولاّت هەڵوەشـاندنەوەی خیلافـەتی ئیـسلامی بـوو، پاشـان دەسـتورێکی نـوێ بـۆ وولاّت دانـرا، دەستورێك کە ئیسلامی وەك سەرچاوەی حوکم و یاسادانان وەلانا، تەنانەت لێرە بەدواوە ئـەتاتورك دەسـتی کـرد بـە دوورخـستنەوەی هـەموو ڕەمـزە ئیسلامیەکان و، دەستیشی کرد بەجێبەجێ کردنـی یاسـاکانی سویـسرا لـە ولاّتدا، بۆ یەکەم جاریش لە تورکیادا حیجـاب و بالاّپۆشـی قەدەغـە کـراو ڕێگا بە ئافرەتان درا بەناوی پێشکەوتنەوە خۆیان ڕووت بکەنەوە.

تەنانـەت لـەناو دەوڵەتـدا شـتێك نـەما بـەناوی وەزارەتـی ئـەوقافی ئیسلامییەوەو لەساڵی "١٩٢٤" دا ئەو وەزارەتەی هەڵوەشاندەوەو، لەساڵی "١٩٢٥" دا دەسـتی کـرد بەداخـستنی مزگەوتـەکان، مـاوەی نێـوان ساڵانی"١٩٣١-١٩٣٢" بەرنامەیـەکی دانـا بەئاراسـتەی سـنوردارکردنی ژمارەی مزگەوتەکان لە وولاّتداو، تەنانـەت ڕێگـەی نـەدەدا ڕووبـەری زەوی

مزگەوتەکان لە "٥٠٠" مەتر تێپەڕ بکات، وەك هەولێکیش بۆ سڕینەوەی قورئان لە مێشکی موسڵماناندا فـەرمانی دەرکـرد کـە زمـانی نوسـین لـە تورکیادا پیتی لاتینی بێت و لەوێوە نوسینی عەرەبیش قەدەغە کرا، هەمان کات فەرمانی دەرکرد قورئانی پیرۆز وەربگێڕدرێتە سـەر زمـانی تـورکی و لێرەوە ئیدی بانگدانی مزگەوتەکانیشی کردە تورکی، لەسـالّی "١٣٤٥" ی کۆچییەوە سالّنامەی ئیسلامی قەدەغە کراو لـەدەزگاکانی حکومەتـدا بـۆ یەکەم جار سالّنامەی زاینی هێنرایە پێشەوە کە هاوکاتی سـالّی "١٩٢٥" بوو، شیاوی باسە لەسالّی"١٩٣٥"وە گۆڕانکاری لە پشوی هەفتەشدا کردو لەجیاتی ڕۆژی هەینی ڕۆژی یەك شەممەی دیـاری کـرد وەك پـشوی فـەرمی دەولّەت، لە هەمووشی خەماوی تر ئەوەبوو ئـەم چـەپەلّە حـەج کردنـی لـە موسڵمانان قەدەغە کرد! پاشان و دوای چەندین سالّ لە قەدەغە کردنی ئـەو دروشمــە گەورەیــەو دواجــار لــە ســالّی "١٩٧٢" داو دوای پێکهێنــانی حکومەت، پارتی ئاشتی دەستی کرد بەپەروەردەکردنەوەی تورکەکان لەسەر ئاینی ئیسلام و دەرگای بۆ حەجی مالّی خـوا کـردەوەو ژمـارەی حاجیـانی تورکیا سالانە دەگەیشتە سـەدو پـەنجا هـەزار حـاجی، ئەمـەش شـتێکی سەرسوڕهێنەر بوو لە مێژووی ئەو ولاتەدا.؟!

هەمانکات ڕووخانی خیلافـەتی ئیـسلامی بـوو بـەهۆی دروسـت بـونی مشتومڕی فیکری لە نێوان بەرەی عـەلمانی و بـەرەی ئیـسلاّحدا، ئاڕاسـتە عەلمانیەکە پێی وەهابوو کە پێشکەوتن بەجیا کردنەوەی ئیسلام و دەوڵـەت دێتە دی و، لەبەرامبەردا بەرەی ڕۆشنبیران دیدو تێڕوانینیـان بـۆ دۆخەکـە بەپێچەوانەوە بوو و دەیانگوت: هۆشـیاری ئوممـەتی ئیـسلامی ناکرێـت لـە ڕووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامیدا ببینرێتە.

بەداخەوە ئەم بیروبۆچونە بۆگەنانەی ئەتاتورك سـەبارەت بەجیاکردنـەوەی ئاین لە دەوڵەت و حوکمداری، هێشتا لەمێـشکی موسـڵمانە سـاویلکەکان نەشۆردراوەتەوە، بەردەوام دوژمنان لەناو جیهانی ئیسلامیدا گومان دەخەنە دڵی موسڵمانانەوە سەبارەت بەنەشیاوی ئیسلام بۆ ئەوەی بکرێتە بەرنامەی ژیانی تاك و کۆمـەڵگا، ڕۆژانـەو بەبـەردەوامی هەنـدێك بـەناو ڕۆشـنبیری موسڵمان ئەو قسەیەی ئـەتاتورك دووبـارە دەکەنـەوەو دەڵـێن: ئیـسلام بـە کەڵکی ئەوە نایەت بکرێتە بەرنامەی مرۆڤەکان لە حوکم و دەوڵەتداریدا.

پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی ماسـۆنیەکانیش بـدەین لـە ڕوخـانی دەوڵـەتی عوسمانیدا، ماسـۆنیەکان ڕۆڵێکـی گـەورەیان بینـی لـە دارشـتنی پیلانـی دۆزەخی بەئاڕاستەی ڕووخاندنی خیلافەتی عوسمـانی، لـەو بـارەوە دائـیرەی

مەعاریفی ماسۆنی دەڵێت: ئەو هەڵگەڕانەوەیەی برای گەورەمان ئەتاتورك پێی هەستا، بووە مایەی سودی هەموان و، سەرئەنجام هێزو دەسەڵات و خیلافەتی ئیسلامی لەناو بردو ئەمەش بوو بەدەسپێکی ڕووداوێکی گرنگ کە بریتیە: لە جیاکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە دەوڵەتو حوکمداری؟! ئایا ئەمە گەورەترین چاکسازی نیە کە ماسۆنیەت لەناو هەموو گەلاندا ئەنجامیدا، بێ گومان کەمال ئەتاتورك نمونەیەکە لە پیاوەکانمان کە لە ماوەی ڕابردوودا توانی ئەوەی خرابویە سەرشانی بە ڕێك و پێکی ئەنجامی بدات، ئەرکەکەیشی بریتی بوو لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی و جیا کردنەوی ئاین و دەوڵەت.

## کۆتایی

ئەمە چاو پیاخشاندنێکی خێرا بوو بەسەر ڕووداوەکانی مێژوودا کە لەوانەیە لەم کاتەدا لە مێشکی موسڵماناندا بوونی نەبێت، هەروەك لە پێشەوە لە بابەتی (الولاء والبراء) دا ڕووغان کردەوە، بەلاّم واقیعی ئێستاو مێژووی نزیك پڕیەتی لەو هەڵوێستانەی بەڵگەمان بۆ دەهێننەوە لەسەر ڕاستی هەڵوێستی کەسانی تر لە کۆمەڵگای موسڵماناندا، هەروەك لە خوارەوە بۆ یاد خستنەوە بە نووکە قەڵەمێك ئاماژەی پێ دەدەین:

* ئەوەی بەرۆکی موسڵمانەکانی تری گرت بە نموونە وەك ئەو کارەساتانەی بەرۆکی کوردستانی گرتووە لەبەرئەوە بووە داوای مافی چارەنوس و سەربەخۆییمان کردوە، بەدڵنیاییەوە ئەو هەموو نەهامەتیانەی ڕووبەڕووی ئەم گەلە بونەتەوە، بەهۆکاری ڕمانی خیلافەتەوەیە، دەبێ ئەو پرسیارە بکەین: ئەم هەموو نەهامەتیانە بۆچی لەسەردەمی خیلافەتی ئیسلامیدا بونیان نەبوو.

* هەروەها ئەو کارەساتانەی بەسەر موسڵمانانی بۆسنەو هەرسکدا هات لەسەر هیچ شتێك نەبوو، تەنها تاوانیان ئەوە بوو ویستوویانە لەژێر ڕوانگەی شەریعەتی خوای پەروەردگاردا دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت.

* هەموو ئەو ڕووداو و چەرمەسەریانەی بەرۆکی ولاّتانی کۆسۆڤۆو مەکدۆنیای گرت.

* هەروەها ئەوەی ڕووبەڕووی موسڵمانانی بەش مەینەتی شیشان

بوویەوە لە ئاوارەیی و دەربەدەری و کوشت و بڕیان لەلایەن ڕووسیای داگیرکەرەوە.

* ئەوەش کە ڕوویدا لە باشووری سوودان و باشووری نەیجیریاو "ساحل العاج" و ئەسیوبیاو ئەریتریا.

* هەروەها هەموو ئەو ڕووداوانەی لە لوبنان دا ڕوویان داو، سەرجەمی ئەو خیانەتە گەورانەی ئەنجامدراون بۆ پێکهێنانی سوپای خاچ پەرستان بەسەرکردایەتی (أنطون لحد).

*ئەو کارەساتانەی کە بەرۆکی موسڵمانانی میانماری گرتوەو کە بەدڕندەترین شێواز هەزارەهایان لێ شەهید دەکرێت.

ئێستا وەك بەچاوی خۆمان دەبینین لەسەر دەستی کەمینەکان و لە شوێنە جیاوازەکانی جیهاندا خوێنی موسڵمانان بەناڕەوا دەڕێژرێت و لەبەرچاوی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ستەمیان لێ دەکرێت، ئەمە لە کاتێکدایە هەر ئەم کەمینانە سەدان ساڵ لەژێر ڕەحمەتی حوکمی ئیسلامیدا بەئارامی و ئاسوودەیی ژیانیان بردوەتە سەرو هەموو مافەکانیان بۆ دابین کرابوو.!!

لە ماوەی ڕابردووداو لە دیراسەیەکی مێژوویی کورت و خێرادا، بە وردبوونەوە لە ڕووداوە مێژووییەکانی کۆن و هاوچەرخ، کۆمەڵە کاروویارێکی گرنگمان خستە ڕوو، سەبارەت بە کەمینەکان و هەڵوێستیان لەبەرامبەر ئەو کۆمەڵگا ئیسلامیەی جێگای گەشەو ژیان و زیندەگی ئەوان

بووەو لەو کۆمەڵگەیەدا هەموو جۆرە ئازادییەکیان هەبووە، وا لە خوارەوەدا بە کورتی لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بە هەڵوێستی کەمینەکان دەکەین بەرامبەر کۆمەڵگای ئیسلامی لەوانەش:

یەکەم: کەمینەکان لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیدا زۆر بەئازادی و سەربەستی ژیانیان دەگوزەراند تا ئەو ڕادەیەی لەگەڵ موسڵماناندا لە مافدا یەکسان بوون و، دەوڵەت هیچ کات ئەوانی جیا نەدەکردەوە لەو کۆمەڵگا ئیسلامییە لەڕووی ئەرك و مافەکانەوە، دەتوانین بڵێین لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامی دا بچووکترین هەڕەشە ڕووبەڕووی کەمینەکان نەدەبوویەوە، تەنانەت لە مێژوودا بەڵگەیەك تۆمار نەکراوە بیسەلمێنێت ڕۆژێك لە ڕۆژان موسڵمانان سەرزەنشتی کەمینەکانیان کردبێت، تا ئەو ئەندازەیەی ئەوەندە بەباشی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کەمینەکان دا کردووە کە بووەتە هۆکاری موسڵمان بوونی زۆرێك لە کەمینەکان.

هەروەك ئەوە بەڕوونی دەبینرێت لە سەردەمی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحدا کاتێك والی (حمص) بوو، ڕەفتار جوانی ئەو و موسڵمانان بەرامبەر گاورەکان هۆکار بوو تا زۆربەی گاورەکان موسڵمان بوونی خۆیان ڕابگەیەنن..

دووەم: کەمینەکان سەرباری ئەو هەموو چاکەو نەرم و نیانی و هاوکارییەی کە لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە پێشکەشیان دەکرا، هەرگیز ئەمەیان لەبەرچاو نەگرتوەو هیچ کات خۆیان بەتاکێکی ئەو کۆمەڵگایە

نـــەزانیوە، تەنانــەت بــەردەوام خۆیــان لــە کۆمــەڵگای موســڵمانان جیــا کردووەتەوەو بیری جیاخوازی و جیابوونەوەیان لەو دەوڵەتــە پــەرە پێــداوەو، هەموو کات کەمینــەکان پێــداگرییان لەســەر ئــەوە کــردووە کــە پێویــستە هــەموویان لــە خۆشــی و ناخۆشــیدا وەك کەمینــە پــشتی یــەکتر بگــرن، هەمانکات ئەمە لەناو گاورەکانی تەرابلوسی شامدا ڕوویــدا، کاتێــك خــاچ پەرستەکان لەکۆتایی جەنگی (صلیب) دا ئــەو شــارەیان بــە جــێ هێــشت، دەستبەجێ کەمینە (گاورەکان) بەماڵ و منالــەوە لەگــەڵ خــاچ پەرســتاندا کۆچیان کــردو شــارەکەیان چــۆڵ کــرد، ئەمــەش ســاڵی "٦٨٠" ی کۆچــی ڕوویدا.

بە هەمان شێوە لە کاتی داگیر کردنی عێـراق لەلایــەن ئینگلیــزەوە لــە ساڵی "١٩١٧"، زۆر بەڕوونی ئەمە دەبینرێت، کاتێك ئینگلیزەکان هاتنــە ناو بەغداد بەشێوەیەکی بەرفراوان گاورو جوولەکەکان هاتنــە پێــشوازییان و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بە هاتنی ئینگلیزەکان و بەئاشکرا ڕایانگەیاند لــە خزمەتی ئینگلیزدان و بەپێی بەرژەوەندییــەکانی داگیرکــەران هەڵــسوکەوت دەکەن و لە ژێر فەرمانی ئەواندا دەجوولێنەوە، لەکاتێکــدا خــەڵکی عێــراق داوای دامەزرانــدنی دەوڵــەتی ســەربەخۆیان دەکــرد، جولەکــەو گاورەکــان دەستبەجێ کەوتنە دژایــەتی ئــەم داواکاریــەو داوایــان کــرد عێــراق لــەژێر چاودێری بەریتانیادا بمێنێتەوە ئەمەش لە ساڵی "١٣٣٨" ی کۆچیدا بوو.

سێ یەم: کەمینەکان هەر بەتەنها بەوەندە ڕازی نــابن لــەڕووی هەســت و

ویژدانەوە خۆیان لەو کۆمەڵگا ئیسلامیە دابڕن کە تیایدا ژیان و گەشـەیان کردو لەخێرو بێری ئەو دەوڵەتـە بەهرەمەنـد بـوون، بـەڵکو لـەوە زیاتریـان دەوێت ئەویش بریتیە لە جێبەجێ کردنی نەخشەو پیلانـە دۆزەخیـەکانیان و نانەوەی ئاژاوەو فەسادو کوشتوبڕ لە سەرانسەری جیهان بە گشتی و جیهانی ئیسلامی بە تایبەت، هەر ئەمـەش وای کـرد کەمینـەکان ببنـە تـاپووری پێنجەم بۆ دوژمنانی دەوڵەتی ئیسلامی، لەبەرئەوە دەسـتیان دایـە ئـاژاوە نانەوەو سیخوڕی کـردن بـۆ بەرژەوەنـدی دوژمنـان، ئـەوان لەگـەڵ هـەموو دوژمنێك دەبنە برا لەپێناو دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانناندا، تەنانەت ئەگەر دوژمنان داوای هاوکاریشیان لێ نەکەن ئەوا بێ گومـان کەمینـەکان هەمیـــشە لــەژێر فــەرمان و خزمــەتی دوژمنـــانی ئیـــسلامدان و، هـــیچ هەڵوێستێکیان لێ نەبینراوە بۆ سەرخستنی ئاینی ئیسلام یان بەرگری کردن لەو کۆمەڵگا ئیـسلامیەی کـە تیایـدا ژیانیـان گوزەرانـد، تـەنهاو تـەنها کەمینەکان زیانیان هەبووە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی، لە حاڵەتێکـدا ئەگـەر بەرگرییان کردبێت ئەوە بەرگرییان لە خودی خۆیان کردوە.

چوارەم: کەمینەکان ناتوانن سەر بڵند بکەنەوە یاخود پیلان دابنـێن یـان هاوکاری لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام دا بکەن، مەگەر لەو ماوەیەدا بێـت کـە بیرو باوەڕی (الولاء والبراء) لەلای موسڵمانان ڕوو لـە لاوازی دەکـات یـان ئاسانکاری لەگەڵ کەمینەکاندا بکەن و بەرزیان بکەنەوە بۆ ئاستی یەکسانی لەگەڵ موسڵماناندا، هەروەك لـە سـەردەمی سـوڵتان مـەحموودی دووەمـدا

هێڵی (هەمایۆتی) یان بەزاند، شایانی باسە هەر لەو سەردەمەدا بوو شوێنی ئاهەنگ گێڕانی ماسۆتی و خوێندنگەی موژدەدەران (تبشیری) کرایەوە.

هەروەها نێردراوە گاورەکانیش سەریان هەڵداو فکری ئازادی خوازی و عەلمانییەت دەرکەوت، هەروەها کەمینەکان لە ئەندەلووس دا دەستیان دایە چالاکی ئەمەش لەسەردەمی سەرۆك هۆزە بەناوبانگەکاندا بوو بەئامانجی دەستوەردان لەکاروباری ئیسلام و بێهێزکردنی بیروباوەڕی موسڵمانان، ئەو دەرفەتەش لەبەردەم کەمینەکاندا کرایەوە تا لەگەڵ ئیسپانیای خاچ پەرستدا پیلان بگێڕن لەدژی ئیسلام، ئەم پیلانەش ئەم ناوچانەی گرتەوە: (التليدة، قرطبة، طليطلة، اشبيلية).

لە بەرامبەردا لەو کاتەی دەوڵەتی موسڵمانان شەرعی خوایان بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و تەواو جێبەجێ دەکرد بەتایبەت بیرو باوەڕی (الولاء والبراء)، لەو سەردەمەدا دەوڵەتی ئیسلامی وەك مەرجێك بیروباوەڕی (الولاء والبراء) ی بەسەر کەمینەکاندا جێ بەجێ دەکرد، ئەمەش سەردەمی هێزو دەسەڵات بوو لەناو دەوڵەتی ئیسلامی دا، کە ئەهلی زیمە نەیان دەتوانی بجووڵێنەوە یاخود دەربچن و خۆیان بشارنەوە یان بیر لە پیلان دانان بکەنەوە لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا؟ چونکە دڵنیابوون لەلایەن شەرعەوە سزای توند دەدرێن..

پێنجەم: هەموو ئەو ئاژاوەو فیتنانەی کەمینەکان لەناو کۆمەڵگای

ئیسلامیدا بەرپایان دەکرد، ئەگەر کۆمەڵگای موسڵمانان پەیوەست بونایە بەشەرعەوەو دەستیان بگرتایە بەبیروباوەڕی پاکی ئیسلامەوە ئەوا بێ گومان کەمینەکان هەرگیز تواناى نانەوەى ئەو ئاژاوەو فیتنانەیان نەدەبوو.

ئەمەش ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەو ڕاستییە گرنگەی کە قورئانی پیرۆز زیاد لە چواردە سەدە لەمەوبەر بڕیاری لەسەر داوەو کاتێك خوای باڵادەست فەرمویێت: ﴿وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٢٠﴾[١٩].

ئەمە سەرباری ئەو هەموو میهرەبانیەی موسڵمانان و دەوڵەتە ئیسلامییەکان کە بەدرێژایی خیلافەت بەرامبەر کەمینەکان نواندویانە، بەڵام کەمینەکان بەهیچ شێوەیەك بەوە ڕازی نەبوون، سەرەڕای هەموو ئەوانەش هەستیان نەدەکرد بەشێکن لەو کۆمەڵگایەو ڕازی نەبوون بەیەك دروشمی نیشتمانی، هەروەها مافی ئەوەیان پێ درا ئیفتارڕ لە کەنیسەکانیاندا بکەنەوەو مۆڵەتی ڕەسمیش بۆ کردنەوەی کەنیسەی نوێ وەربگرن...هتد. هەموو ئەم چاکانە کەمینەکانی ڕازی نەکرد..!

لەبەرئەوەی کەمینەکان لە سەرەتاوە دوژمنی خواو پێغەمبەر ﷺ بوون و هەر لەو سەنگەرەشدا دەمێننەوە تا کۆتایی، ڕەحمەت لەو شاعیرەی کە

---

[١٩]- البقرة: ١٢٠.

فەرموویەتی: ﴿كـل العـدوات ترجـي مودتهـا ❊ الا عـداوة مـن عـاداك في الدين﴾

سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، اشهد ان لا اله الاانت استغفرك واتوب اليك، وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آلـه وصـحبه وسـلم، سـبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين، والحمد لله رب العالمين.

## سەرچاوەکان

١- البداية والنهاية، (ابن كثير).

٢- أسباب سقوط دولة العثمانية.

٣- الدولة العثمانية: عوامل النهوض والسقوط (د.علي محمد الصلابي).

٤- الأندلس من الفتح العربى المرصود الى الفردوس المفقود (د.عصام محمد شبارو).

٥- في تأريخ المغرب والأندلس (د.أحمد مختار العبادي).

٦- شخصيات ظلمها التأريخ: سلطان عبدالحميد الثانى (محمد مصطفى الهلالي).

٧- سلطان عبدالحميدالثانى: آخر السلاطين العثمانيين الكبار (د.محمد حرب).

٨- الأقليات ودورها فى السقوط الدول الأسلامية (شريف عبدالعزيز).

٩- وضع الأقليات في الدولة الأسلامية (محمد بن شاكر الشريف).

١٠- حملة نابليون على مصر (سليمان بن صالح الخراشي).

١١- خيانة نصارى فى تأريخ مصر الحديث وقتالهم بجوار حملة الفرنسية.

١٢- الصليبة ودور الأقباط في الحرب.

١٣- كيف دخل التتر بلاد المسلمين (سليمان بن حمد العودة).

١٤- أرشيف الاوسمة: حول دور النصارى الأقباط اثناء الغزو الصليبى الفرنسي لمصر.

١٥- أقباط مجرمون (د. هاني السباعي).

١٦- هوّلاكوّ (منصور عبدالحكيم).

١٧- المنارة المفقودة (د.عبدالله عزام).

١٨- دەوڵەتی خیلافەت (ئیکرام کەریم).

١٩- لەنێوان دوێنی و ئەمڕۆدا (X.A.M).

٢٠- ژیانی ئازیزمان (حبیب محمد سعید).

٢١- گوڵاوی سەرمۆر (صفی الرحمن مبارکفوری).

٢٢- تەفسیری ڕامان.

پێڕست

پێشەکی ---------------------------------------- ٣
دەروازە ----------------------------------------٦
کەمینەکان لە کەلەپوری ئیسلامیدا ---------------------------- ١٣
جۆرەکانی کەمینە ---------------------------------- ١٧
پەیماننامەی ئەهلی "زیمە" ---------------------------٢٣
کەمینەکان و دەوڵەتی موسڵمانان ------------------------٢٧
جولەکەکان و هەوڵە بەردەوامە شکست خواردووەکانیان، لە بۆ ڕووخاندنی
یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی------------------------------٣٥
جولەکە واز لە خیانەت و فرت و فێڵ ناهێنێت-----------------------٤٣
بەنو قینقاع، لە هاوپەیمانیەوە بۆ پەیمان شکاندن -------------------٤٥
"کەعبی کوڕی ئەشرەف"یش ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەدات ----٤٨
هۆزی (بنو نچیر) و هەوڵە شکست خواردوەکەیان بۆ شەهید کردنی پێغەمبەری خوا
(ﷺ) ---------------------------------------- ٥٠
(بنو قریظە) ش چووە پاڵ ئەحزاب---------------------------٥٤
پیلانێکی شکست خواردو بۆ شەهید کردنی پێغەمبەر (ﷺ) ------------ ٦١
کەمینەکان و ڕۆڵیان لە کەوتنی دەوڵەتی (ئەندەلووس)ـدا------------٦٢
کەمینەکان و ڕۆڵیان لە هاوکاری کردنی مەغۆلەکاندا بۆ داگیرکردنی بەغداد. ٧٢
کۆکردنەوەی هێز بۆ گرتنی شاری بەغداد -----------------------٧٩
کەمینەکان و ڕۆڵیـان لە هاوکاری کردنی مەغۆلەکاندا بۆ داگیرکردنی دیمەشق ٩٨
بەرەو داگیرکردنی دیمەشق--------------------------------- ١٠٤

کەمینەکان و ڕۆڵیان لە هاوکاری کردنی فەڕەنسیەکان و هێرشکردنە سەر میسرو داگیرکردنی ---------------------------------- ١٠٨
کەمینەکان و ڕۆڵیان لە کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیدا --------------- ١١٧
خستنەڕوی ڕۆڵ و کاریگەری کەمینەکان بە گاورو جولەکەوە لە ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا ---------------------------------------- ١١٩
ڕمانی خیلافەتی ئیسلامی و سەرەتای نەهامەتیەکان؟! -------------- ١٥٢
جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، یەکەمین بەرهەمی ڕمانی خیلافەتی ئیسلامیە! ١٥٤
کۆتایی------------------------------------------ ١٦١
سەرچاوەکان ---------------------------------- ١٦٩

بە ئاوڕدانەوەمان لە مێژووی ئیسلامی بۆمان دەردەکەوێت هیچ کات زۆرینەو کەمینە نەکراوە بە پێوەر، ئەوە ئەو دیموکراسیەتە درۆزنەی ڕۆژئاوایە بە یاسایەکی دەستکردی مرۆڤەکان دیکتاتۆریەتی زۆرینە دەسەپێنێت و کەمینەکان دەکاتە ژێردەستەو، بیانو دەداتە عەلمانیە داردەستەکانی خۆیان تا بکەونە وێزەی خەڵک و قەسابخانە بنێنەوە.

ئەوەش دادگەری پەیامەکەی پەروەردگارە سەلاحەدینێکی ئەیوبی کوردزوبان دەکاتە سەرۆکی دەوڵەتێکی ئیسلامی و پێشڕەوایەتی جەنگی دژە خاچ پەرەستان دەکات و لەقوڕیان دەنێت.

ئەوەش ئیمامی ئیبن تەیمیەو ئیبن خەلەکان و ئیبن سەلاحی شارەزووری و ... کە لە نەتەوە شیرین و ئیسلام دۆستەکەی کورد بون و هەمان کات دەستی باڵایان هەبوو لە بە ئاگاهێنانەوەو ئاڕاستە کردنی ئوممەتی ئیسلامیدا.

ئەوەش تاریقی کوڕی زیادی ڕزگارکەری ئەندەلوسە، کە ناوبراو لە بەربەرەکان بوو.

ئەوە هەریەکە لە ئیمام تیرمزی و نەسائی و ئەبوداوودو ... خۆ ئەمانە هیچیان عەرەب نەبون، بەڵام لەزانستی فەرمودەناسیدا گەیشتنە لوتکە

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی بێخود

نرخی ( 3500 ) دینارە